# لەئوم ڕێعانەوە بۆ تۆپزاوا

## ئەو سایەق شوفلەی بەشێک لە ئەنفالەکانی دا پۆشی



عارف قوربانی

# لەئوم ڕێعانەوە بۆ تۆپزاوا

ئەو سایەق شۆفلەی بەشێك لەئەنفالەكانی داپۆشی

عارف قوربانی

- ناوی کتێب: لەئوم ڕێعانەوە بۆ تۆپزاوا
- عارف قوربانی
- چاپ ٢٠٠٤ کەرکوك
- پیتچنین : ئیدریس سەعید
- بەرگ: شۆڕش ئەحمەد
- تیراژ: ( 1000 ) دانە
- چاپخانە: چاپخانەو ئۆفسێتی تیشك
- ژمارەی سپاردن ژمارە (١٣٣) ساڵی ٢٠٠٤ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێدراوە
- لەچاپکراوەکانی: دەزگای هەواڵ بۆ ڕاگەیاندن و ڕۆژنامەوانی

پێشکەشە بە:

# شێخ حسێن شێخ کاکە حەمەی هەزارکانی

کەلەکاتی ئەنفالدا خۆیو ١٢ ئەندامی خێزانەکەی وەك هەزاران ژنو منالو پیرو پەککەوتەی تری کوردستان لەگوندەکەی خۆیاندا بەر ئەو گردە بەدنا . کەوتن.

هەر دوای هەوالی دەستگیرکردنی ئەم پیاوە ئایینیو کۆمەلایەتیە ناودارەی گەرمیار بەشێك لەخزمو دۆستو ناسیاوە دەستڕۆکانی خۆیان دەگەیەننە (عزەت دوری)و تکای لێدەکەن کە هەولی ئازادکردنی بدات، عزەت دوریش بۆ یەکەمین جار لەژیانیدا جورئەت دەکات تەکلیف لە (سەدام حسێن) بکات کە ئەو پیاوچاکە ئازاد بکەن..

سەدام لەسەر داوای عزەت دوری بروسکەیەك ئاراستەی فەیلەقی یەك دەکات کە سەرکردایەتی قۆناغەکانی ئەنفالی دەکرد کە شێخ حسێن ئازاد بکەن.

کاتێك ئەم بروسکەیەی سەدام دەگاتە دەستی فەرماندەی فەیلەقی یەك هەموو ئەنفالکراوەکانی گەرمیان گواستراونەتەوە (قۆرەتوو) کە کەمپی کۆکردنەوەی دەست بەسەرکراوەکانی کەلارو کفریو نەجولو بەشێك لەگوندەکانی گەرمیان بوون..

(قائید فەیلەق) خۆی دەچێتە قۆرتوو لەناو ئەو هەزاران کەسەدا شێخ حسێن دەدۆزنەوەو دەیهێننە لای فەرماندەی فەیلەقو پێی رادەگەیەنن کە تۆ لەسەر (فەرمانی سەرۆکی فەرماندە) ئازاد دەکرێیت برۆ ژنو منالەکانت بهێنەو بۆ هەر شوێنێك پێت خۆشە ئەتبەین.

شێخ حسێن بەفەرماندەی فەیلەقی یەك دەلێت: ئەی ئەم قەومو قیلە چی لێدەکەن؟ وەلامی دەداتەوە کەئەوانە حیجزن.. شێخ حسێن دەلێت: منیش نامەوێ ئازادم بکەن.!

قائید فەیلەق وەلامی دەداتەوە (سەیدلرەئیس ئەمری کردوە کەدەبێت ئازادبکرێیت) شێخ پێیان دەلێت: سەدام ئەمری بۆ ئێوە کردوە.. من ئەمر بەخۆم دەکەم نامەوێ لەخزمو کەسوکارو ئەم خەلکەی گەرمیان جیابکرێمەوە.. شێخ حسێن رازی نەبوو ئازادی بکەن، خۆی هەر ١٢ ئەندامەکەی خێزانی لەگەل گەرمیانیەکانی تردا ئەنفالکران.

*ئوم ڕێعان: ناوی گوندێکه (١٥) کیلۆمەتر لەفازای (حەی) پارێزگای (کوت)ەوە دووره، ئەو گوندەیە کە "عەبدول حەسەن موحان موراد" تیایدا لەدایکبووە.

*تۆپزاوه: گوندێکی گەورەی کوردستانە (١١) کیلۆمەتر کەوتۆتە خۆرئاوای شاری کەرکوکەوە. لە ئەنفالدا وەک کەمپی کۆکردنەوەی سەرەکی ئەنفال بەکاربراوەو دواتر لەوێوە ئەنفالەکان لەیەکتر جیاکراونەتەوەو دابەشکراون بەرەو شوێنە نادیارەکان.. هەمان ئەو شوێنەیە کەژمارەیەک لە گەنجە ئەنفالکراوەکانی لێ گوللەبارانکراوەو هەرلەوێ کراون بەژێر خۆڵەوە، وەک لەشایەتی (عەبدول حەسەن موراد)دا دەردەکەوێ.

# دەستپێك

ئێمە پێشتر هەندێ باسی ئەنفالمان کردووە کەم تا زۆرێك و بەپێی توانا و ئیمکان و ئەوەندەی بواری کارمان بۆ رەحسابێ، هەندێ دیووی شاراوەی ئەنفالمان خستۆتە ڕوو، بەندە پرۆژەی کتێبێکی چڕ ز بەرگیم هەبوو لەسەر ئەنفال و تۆمارکردنی دیووی ناوەوەی ئەنفال لە زمانی شایەتحاڵەکانەوە و تائێستا لە سێ بەرگیان دا قوربانیانی ئەنفال ئەوانەی خۆیان بەر ئەنفال کەوتوون و بەرێککەوت لەو سەفەری مەرگە گەڕاونەتەوە تۆمارم کردوون و بەرگی چوارەمی ئەو پرۆژەیەم هێشتەوە بۆ دوای روخاندنی (سەدام) تا ئەم بەرگەیان تەرخان بکەم بۆ دیووەکەی تری ئەنفال و هەوڵدەم پێچەوانەی سێ بەرگەکەی تری (شایەتحاڵەکانی ئەنفال) ئەمجارە لە جیاتی قوربانیانی ئەنفال، (جەلادەکان) خۆیان بدوێنم، ئەوانەی دەستیان لە ئەنفال دا هەبووەو خۆیان بەشداری راستەوخۆی ئەو پرۆسەی کورد قڕانە بوون... ئەمەم وەك پرۆژەی کاری داهاتووم لای خۆم بەرنامە رێژ کردبوو چەند جارێکیش لای دۆست و هاوڕێیانم ئەم مەسەلەیەم درکاندووە ... هەر بۆیە لە دوای پرۆسەی ئازادی عیراق دا پاش ئەوەی سەدام و رژێمەکەی تەخت و تاراجیان وێران بوو کەوتمە هەوڵدان بۆ دەست پێ کردنی ئەم پرۆژەیەو سوپاسی ئەو ئازیزانەش دەکەم کە لە هەر شوێنێ زانیارییەکیان بەردەست کەوتبێ ئاگاداریان کردووم کە ئەم دیدارەی ئێستا لە بەردەستدایە بەرهەمی جۆرێك لەو حاڵەتانەیە.. گەرچی ئێستاش نازانم و نەمپرسی ئەم کابرایە چۆن گەیشتە بەرێز

د. بەرهەم سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستان وکـێ بـردی.. بـەڵام مـن لـە رێگـەی ئـەوەوە ئاگاداربووم کـە کەسێك بـەناوی (عبدالحسـن موحان مراد) لەسەردەمی ئەنفال دا لە (جیهازی ئەمنی خاص) کاری کـردووە لەگـەڵ (عـەلی حەسـەن مـەجید) دا بـووەو دەسـتی لـە ئەنفالدایەو خۆی چاڵی بۆ ئەنفالـەکان هەڵکەندووە و خۆڵـی کـردووە بەسەریان دا و ئێستا ئامەدەیە ئەو شایەتی‌یە بدات تەنانەت لە دادگای نێو دەوڵەتیش بێت.. کـە ئەمـە بـۆ کورد گرنگی‌یـەکی زۆری هـەبوو.. گـەرچی ئـەنفال کارەساتێك نی‌یـە کـەس بتوانـێ بیشـارێتەوە بـەڵام شایەتی عـەرەبێکی سـەر بـە ئـەمنی خـاص بـۆ قـەزێی ئـەنفال زۆر پێویست و گرنگ بـوو.. هـەروا دەرۆژێك بـۆ دوو هەفتـە ئـەبوو کـە رژێمی بەعس روخـابوو شـەوێك بـرای رۆژنامەنووسـم سـتران عبـدالله تەلەفۆنی بۆ کردم ووتی چاوەڕێم بـە مـن دێـم و پێکـەوە دەرۆیـن بـۆ کەرکوك کارێکی گرنگ هەیە باسی دەکەین کە پێمان سپێدراوە.

رۆژی دواتـر لـە چەمچـەماڵ چاوەڕوان بـووم لـەو شـوێن و کاتـەی لەسەری رێـك کەوتبووین (سـتران عبـدالله و عبدالباسـط ) راوێژکاری یاسایی ئەنجومـەنی وەزیـران هـاتن .. بەسـەیارەکەی ئـەوان پێکـەوە بەرەو کەرکووك بەرێکەوتین .. لەرێگـە سـتران عبـدالله ووتـی: دکتـۆر بەرهەم سەرۆکی حکومەت بـۆ بـەدواداچوونی راستی و دروستی ئـەو باسە لیژنەیەکی پێکهێناوە لەلایەك بۆ لێکۆڵینەوە و لەلایـەکی تریـش بۆ بەدواداچوون و تۆمارکردنی زانیاری‌یەکان و ئامۆژگاریشی ئەوەبووە کە دەبێ ئەم کارە زۆر بەنـهێنی بـەڕێوەبچێت، لەلایـەك بـۆ پاراسـتنی گیانی شایەتحاڵەکە تالەدادگای نێو دەوڵەتی‌دا لەپێش چاوی رای گشتی و دونیـا و بەتایبـەت جیـهانی عـەرەبی راسـتی‌یەکان بگێرێتـەوەو

لەلایەکیش لەترسی ئەوەی کە بلاوبێتەوە کە گۆڕی بەکۆمەڵی ئەنفالەکانمان دۆزیوەتەوە ئەوە کەس و کارو پاشماوەکانی ئەنفال هەڵی دەدەنەوەو زانیاریەکانیش و ئێسك و پروسکەکانیش دەشێوێت .. بۆیە دەبێ زۆر بەووردی و بەنهێنی ئەم کارە ئەنجام بدرێت .. لیژنەکەش بریتی بووە لە عبدالباسط راوێژکاری یاسای ئەنجومەنی وەزیران و ستران عبداللە بەڕێوەبەری گشتی پەیوەندیەکانو ڕاگەیاندنی ئەنجومەنی وەزیران و عارف قوربانی هەر ئەو ڕۆژەی دەستمان بەکارەکان کرد لەمۆزەخانە (مەتحەف) ی کەرکوك چاومان بە عبدالحسن موحان موراد کەوت کە کابرایەکی رەشتاڵەی بەخۆبوو ، جامانایەکی سوری کردبووە سەر سیمایەکی عەرەبیانەی پێوە دیاربوو .. لەژوورێکی بچوکی ( ٣×٤) دا دیدارێکی وردمان لەگەڵدا سازکرد جگە لەم لیژنە سێکەسیەی ئێمە (وەستا حسن)ی ئاسایشی سلێمانی لەوێ بوو. بەوەدا شتێ تێگەیشتین کەرەنگە لەڕێگەی ئەمەوە ئەم (عەرەبە ئەنفالچیە) گەیەنرابێتە سەرۆکی حکومەت.. زیاتر لەدوو بۆ سێ سەعات لەوێ دانیشتین و دواتر چووینە ئەو شوێنانەی کە ١٥ ساڵ لەمەوبەر لەشەوێکی مانگی ئابدا ئەم کابرا عەرەبە بەشۆفڵ براو خوشکەکانمانی داپۆشیەوە .. دوای ئەوەی دەستنیشانی شوێنەکانی کرد گەڕاینەوەو بۆ سبەی بە (حەفارە)یەکەوە چووین خۆیمان خستە سەر حەفارەکە تاوێنەی بگرین کە چۆن کاتی خۆی چاڵی کردووەو دای پۆشیون ئەوەی سەیر بوو بەلامەوەو هەر لەوێ دا بڕیارم دا کە لەکاتێکی گونجاودا زۆری لەسەر بنوسم ئەوەبوو کەئەم کابرایە وەك ئەوەی هیچ رووی نەدابێ زۆر بەئاسایی چووە سەر(حەفارەکە)و چاڵی دەکرد کەمن قەناعەتم وابوو نەتوانێ لێیبخوڕێتو یەکە یەکە لاشەی

ئەو ژن و منالانە بێتە بەرچاوی وهیچ نا گلەیی لێ بکەن کە لاشەکانی شێواندوون .. بەلام ئەو شعورەم لێ نەبینی ... بۆیە زیاتر لـەو ڕۆژەوە رقێکی پەنگ خواردووم نەك لەخۆی تەنانەت لەنەتەوەکەشـی هەیـە!! ئێمـە پێنـج ڕۆژ بـە ٣ حـەفارەوە لـەوێ خـەریك بوویـن و هـەموومان بڕیارمان ئەوەبوو کەابەر ئەو هۆکارانەی سەرەوە ئەمە رانەگەیەنین و بـلاوی نەکەینــەوە . هەرچــەندە زۆربەشــی بــەکامێرای ڤیدیــۆ تۆمـارکراوەو زۆر وێنـەی فۆتۆگرافیـش گیراوە کـە جیـاواز لـەوەی مـن کامێرای خۆم پێ بوو هەر سێ برای وێنەگر (هانا قاسم و تەها لەتیف و حمـە علـی) ئـەو شـەرەفەیان پێـبڕاوە بەشـداری تیمەکـەمان بـوون لـەکاتی کارەکـەماندا و لەشوێنی ناشـتنی ئەنفالـەکاندا دووجـار تیمـی ڕۆژنامـەنووس و ڕاگـەیاندن هاتنـە سـەرمان کەیـەکیان بیـانی و ئـەوی تریان تەلەفزیۆنێکی کوردی بوو بەلام لەهیچ کامیـاندا رێگـەمان نـەدا وێنەی بگرن و دیداری لەگەڵ ساز بکەن .. خۆشمان دواتر ئەو دیدار و چاوپێکەوتنانـەی کردبوومـان بلاومـان نـەکربۆوە وەك ئیلـتزامێکی ئەخلاقی بەپیشەکەمان ولەهەمان کات دا بەهەسـت کـردن بـەوەی کـە بەرژەوەندی بالای میللەت وادەخوازێ ئـەو کـارە بـەو شـێوەیە بـەڕێوە بچێت تا کاتی خۆی دێت و ئەوکات راگەیاندنی دونیـای بـۆ بانگهێشت بکەین.. بەلام جێیداخـە.. ....... ...... .......... ...... ...... ...... ......

................. ....................... ..... ............ ...... ... ... ......

.. ............ ................. ................. ..................... .. ...

وا لە ناچاریدا ئەو دیدار و چاوپێکەوتنانـە بلاو دەکەمـەوە کـە لـە سێ دانیشتن و چاوپێکەوتنی جیاوازدا ئەم بەرهەمەی لێکەوتەوە ...

*** گەر سەرەتا ناوی خۆتمان پێ بڵێی .. ؟**

-ناوم عبدالحسن موحان مورادە.

*** لەدایك بووی چ ساڵێکی ..؟**

- ساڵی ١٩٦١.

*** لەکوێ لەدایك بووی ؟**

- پارێزگای کوت.

*** مەبەستت لەپارێزگای کوت ناوشارەکەیە؟**

- نەخێر لەگوندی (ئوم رێعان)ی نزیك قەزای (حەی) کەسەر بەپارێزگای کوتە لەوێ لەدایك بووم.

*** گوندەکەتان چەند لەقەزای (حەی)یەوە دوور بوو ؟**

- نزیکەی ١٥ کم.

*** باوکت چ کارەبوو ؟**

- باوکم جووتیار بوو .. خەریکی کاری کشتوکاڵی و مەڕداری بووە.

*** خوێندەواری هەبوو؟**

- من.. !

*** نا ، باوکت!؟**

- نەخێر.

*** وەك بۆیان گێڕابیتەوە، یان خۆت بەبیرت بێت گوزەرانی ئەو کاتەی ماڵەوەتان چۆن بووە..؟**

- ژیانێکی ئاساییمان هەبووە.

*** چەند سەر خێزان بوون ..؟**

- دوو براو چوار خوشك بووین، دایكم و باوكم، هەشت سەر خێزان بووین.

*** گوندەكەتان قوتابخانەی تیابوو؟**

- بەڵی ..

*** چویتەتە بەر خوێندن؟**

- بەڵی ..

*** ئەی براكەت و خوشكەكانت.؟**

- نەخێر ئەوان نەیانخوێندووە ...

*** بۆ ..!؟**

-ماڵمان لەلادێ بوو خەریكی كاری جووتیاری و مەڕداری بووینە .. لەلادێشدا كەڕیانت لەسەر كشتوكاڵ و مەڕداری بوو منداڵ بوڵای ئاژەڵ و سەر دەغڵ و دان پێویستە زیاتر لەقوتابخانە..!

*** ئەی تۆ چۆن خراویتە بەر خوێندن..؟**

- من نازانم، ئەوەیان باوكم وای كردووە . من منداڵ بووم كاتێ هەستم كردوو خۆم ناسیبەوە لەقوتابخانە بووم .. رەنگە براو خوشكەكانیشم حەزیان لە قوتابخانە كردبێ و باوكم نەیناردبێتنە قوتابخانە .. یان منیش بەحەزی خۆم بوایە رەنگە حەزم لێ نەبووبێ ، ئەوەیان باوكم لێی بەرپرسە نەك من ..

*** گوندەكەتان تەنها قوتابخانەی سەرەتایی تیابووە یاخوود ناوەندیش.؟**

- نا ، تەنها تا پۆلی سێی سەرەتایی تیابووە. ناوەندی چی.!

*** كەواتە تۆ تا پۆلی سێی سەرەتایت خوێندووە..؟**

- نەخێر من دوای ئەوەی پۆلی سێی سەرەتاییم تەواوكرد لەگوندەكەی خۆمان (ئوم ڕیعان) پاشان چوومە قەزای (حەی) شەشی سەرەتاییم خوێندوو دواتر ناوەندیش تاپۆلی سێیەمم لەقەزای (حەی) خوێند بەڵام لەپۆلی سێ

راسب بووم ئیتر وازم لەخوێندن هێنا .. چونکـە هـاتوچۆم دەکـرد مەسـرەفی خوێندنم قورس بوو کەراسب بووم تاقەتی خوێندنم نەماو بڕیارمدا کەئیتر بیر لەئیشێك بکەمەوە ژیانم دابین بکات..

*** ئێ چی کارێکت کرد بۆ باشکردنی گوزەرانت..؟**

- لەدایرەی جنسیەو سەفەر بووم بەپۆلیس ..

*** کەی دامەزرای..؟**

- لەرۆژی ١٩٧٨/٣/٣٠ یەکەم ڕۆژی دامـەزراندن و دەست بـەکاربوونم بوو.

*** لە چی جێگایەك..؟**

- نالێم دایرەی جنسیەو سەفەر ..

*** مەبەستم لەشوێنی دایرەکەیە .. لەقەزای حەی یان جێگایەکی تر ..!؟**

- لەپارێزگای کوت.

*** موچەی مانگانەت چەند بوو کە پێی دامەزرای ..؟**

- موچەکەم ٥٣ دینار بوو .

*** ئێ دوای ئەوەی کە دامەزرای ودەوامت کرد ..؟**

- چوار مـانگ لەکوت مامـــەوەو دواتـر گواسـترامەوە بـۆ بەڕێوەبەرایـەتی گشتی جنسیەو سەفەر لەبەغدای پایتەخت...

*** ببورە مـــن دەبـوو پێشـتر ئـەو پرسـیارەم بکردایـە ، بـەپێی مێـژووی ساڵی‌لەدایك بوونت کە ئەڵێی لە ١٩٦١ لەدایك بووم و لەگەڵ ئەو مێژووەی دامەزراوی بەپۆلیس لەساڵی ١٩٧٨ .. تۆ ئەو کاتە تەمـەنت ١٧ سـاڵان بـووە چۆن وەرگیراوی یاخود چۆن دایانمەزراندووی لەکاتێکدا تەمـــەنت خـوار ١٨ ساڵان بووە ..؟**

- من تەتەوع بووم ئەو کاتە خەڵکیان بەتەتەوع وەردەگرت تەمەنی هەرچەندێك بوایا ....

**- تاکەی لەبەغدا مایتەوە ..؟**

- چەند جارێك گواستراومەتەوەو گەڕێنراومەتەوە بۆ بەغدا، بەڵام تاساڵی ١٩٨٠ لەو بەڕێوەبەرایەتی‌یە بووم لەساڵی ٨٠دا بەڕێوەبەرایەتی‌یەکە کرا بەسێ بەش ، بەشێکی بوو بە (ئیقامەت موخابەرات) بۆ بێگانەکان هەر لەبەغدابوو .. بەشێکی بوو بە (جەوازات) کەمن بەر ئەو بەشەیان کەوتم و گواسترامەوە بۆ مدیریەتی ئەمن لە عەر عەر بەشی جەوازات .. بەشی سێیەمیش بەڕێوەبەرێتی ڕەگەزنامەو باری کەسێتی .

*** لەسەر داوای خۆتان خرانە سەر بەشەکان ؟**

- نەخێر ناوی هەرکەسێك لەکوێ دەرچوایا دەبێ بچی لەوێ دەوام بکەی یان بۆ هەر شارێك بیان گواستایەتەوە دەبێ بچی ..

*** کەواتا تۆ لەکەیەوە تێکەڵ بەدەزگای (ئەمن ) بووی ..؟**

- لەساڵی ١٩٨٠ کە نەقڵ کرام بۆ ئەمنی عەرعەر ..

*** چی کارێکیان پێ سپاردی لەئەمنی عەرعەر ..؟**

- بووم بەسایەق .

*** سایەقی سەیارەی شەخسی مودیر یان دایرە ؟**

- نا ،من سایەقی سەیارەی گەورەبووم.

*** مەبەستت چی‌یە لەسەیارەی گەورە ..!؟**

- گلاّبەو شۆفلّ و حەفارە ..!

*** دەزگای ئەمن کەلاّبەو شۆفلّ و حەفارەی بۆچی بووە، واتۆ شۆفێری بووی ؟**

- هەموو جۆرە سەیارەیەکیان هەبووە بۆ کاری تایبەت بەکاریان دەهێنا.

*** کاری تایبەت وەکو چی .. گەر زیاتر بۆم روون بکەیتەوە ..؟**

- بەرپرسە گەورەکانی ئەمن هەموویان (مەزرەعەیان) هەبوو لەمەزرەعەکاندا کاریان پێدەکرد ..

*** تێدەگەم بەرپرسەکانی ئەمن سودیان لەگەل و پەلەکانی فەرمانگەکان بینیوە بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەلاّم ئەو بەرێ .بەرێتی و فەرمانگانەی ئەمن چی کاریان بە حەفارەو شوّفلّ بوو.. یان سەرکردایەتیو دەوڵەت بۆچی بۆی دابین کردبوون ئایا تەنها بۆئەوەی بەرپرسەکان لەمەزرەعەکانیاندا سوودی لیّ وەرگرن. یان لەئەمن کارێکیان بەو شۆفلّ و حەفارانە هەبوو لەپالّ ئەو کارەوە بۆکاری شەخسی بەرپرسەکانیش بەکار دەبرا ..!؟**

- کەمن نەقلکرامە ئەویّ ئەو ئالیەتانەی تیابوو دواتریش بۆ هەرشوێنیّ نەقلّ کرابێتم لەدەزگاکانی ئەمن هەمووی هەر هەیان بوو ئیتر نازانم بۆچی هەیان بووە یان چۆن بۆیان دابینکراوە.

*** هیچ کات ئەو پرسیارەت نەکردووە بەتایبەت کەسەرەتا چوویتە ئەویّ نەت پرسی ئەو ئالیاتانەتان بۆچییە.؟**

- نەبەخوا نەمپرسی.

*** ئەی کە دواتر بووی بەسایەقی و خۆت کارت پێدەکردن بۆت روون نەبووەوە ئەمن بۆچی بەکاریان دەهێنیّ ..؟**

- ئەی نەمووت بۆ مەزرەعەی بەرپرسەکان ..؟

*** تۆ ئەو ماوە زۆرەی کارت لەسەر کردووە لەدەزگایەکی تایبەتی وەك ئەمن دا خۆمان دەزانین ئەمن لە عێراق دا چۆن بووە، چۆن تەنها بۆ مەزرەعە بەکارهاتووە ، گەر وابوایا دەتوانرا سوود لە ئالیاتی رێگاو بان (ئیشغال) وەرگرن بۆ مەزرەعەکانیان یان سوود لە وەزارەتی زراعە وەرگرن**

**ج پێویست بووە بەناوی ئەمنــەوە ئـەو ئالیاتانـە دابـین بکرێـت و تەنـها بـۆ مەزرەعەی مودیری ئەمنەکان بێت ..؟**

- نا ، تەنها بۆ ئەوە نەبووە بەتایبەتی... ئالیەتەکان مولکی دەزگای ئەمن بوون ئیش و کاری دەزگای ئەمنیان پـێ دەکـردو ئیـش و کـاری مەزرەعـەی بەرپرسەکا . ش ..

*** ئێ، منیش مەبەستم ئەوەیە ئیش وکارەکانی دەزگای ئەمن چی بـوون کە بەشۆفڵ و حەفارە ئەنجام دەدرا ..؟**

- بۆ نموونە ناوحەوشەی دایرەکەیان تەخت بکردابا یاخود رێگای دایرەیان دروست بکردایە یاخود چاککردنی بە شۆفڵ و حەفارەی خۆیان ئەیانکرد بـۆ ئەوانەیان بوو..

*** هەسـت ئەکـەم خەریکـە لەیـەکتری تـێ بگـەین ، چـی تریـان پـێ دەکرد..؟**

- هەر ئیشێکیان هەبووایە پێویستی بەشۆفڵ و حەفارە بووایە..!

*** ئاخر وەکو چی .. گەر نموونەی زیاترم بدەیتێ ..؟**

- بۆ نموونە لەناو حەوشـەی دایـرە زینـدانـی ژێـر زەوییـان دروسـت ئـەکرد بەحەفارەو شۆفڵی خۆیان ئەیانکرد تا بەنهێنی بێت چونکـە ئەگـەر شـۆفڵ و حەفارەو گەلاّبەی دەرەوەیان بهێنایا نهێنی دروستکردنەکەی ئـەچووە دەرەوەو ئاشکرا ئەبوو .

*** تۆ هیچ جارێك ئەو کارەیان پێ کـردووی لـەناو بینایـەی دەزگاکـانی ئەمندا چاڵت پێبکەن و بۆژێر زەوی یاخود زیندانی تایبەت ؟!**

- مـن تەنـها سـایەق نـەبووم تـا ئـەو کـارە بەتەنـها بـەمن بکـەن .. هـەر بەرێوەبەرێتییەك لەگەڵ ئالیەتەکان چەندین شۆفێری هـەبوو ، رەنگـە کـەمن ئیجازە بووم شۆفێرەکانی تر کردبێتیان..

* حالەتەکان ئاسایە گەر هەرچی زیندانی ئەم وولاتە هەیە تـو دروسـتت کردبـی .. توکەسیکی تەنـها جیبـەجیکردنت لەسـەر بـووه بریارەکـان لەسەرووی تووەو لەشوینی ترەوە دراون ..؟

- بـەلی زور جـار لـەناو دایرەکـان و لـەدەرەوەی شـارەکان و لـەناو سەربازگەکانیش دا چالیان پیمان کردووەو کردوویانـە بـەزیندانی تایبـەت و خەلکیان تیا بەند کردووە..

* چی تریان بەو حەفارەو شوفلانە دەکرد..؟

- هەر ئەو شتانەی کەوتم .

* ئیمە هەموومان لەعیراقدا ژیـاوین و زەبـرو زەنـگ و درنـدەی رژیمـی بەعسمان بەچاوی خومان بینیوەو بەتایبەتیش ئیستا لەدوای رووخـانی رژیـم دا زور نهینی ئاشکرا دەبن .. دەزانین بەهەزاران گوری بەکومەلی هـەبووە .. هەزاران مروڤی بی گونـاهی کـردووە بـەژیر خولـەوە یـان زور کەسـی ئیعدام کردووەو تەرمەکەی نەداوەتەوە کەس و کاری و لەچالی ناوە . رژیم هەموو ئەمانەی کردووە و هەموو لایەك ئەمە ئەزانی بـەلام گرنگـە کەسـیك خوی شایەنتالی ئەنجام دانی تاوانەکان بیت و پەردەیان لەسەر لابـدات .. دلنیابە ئەوە کاریکی مروڤایەتی گەورەیە تودەیکەیت.. بـو ویژدانـی خـوت باشە بو دواروژت لای خواش چاکەیەکی گەورەت بو تومار دەکریت کە بـی پیـچ و پـەنا هەرچی‌یـەك بیستووتە یـان دەیزانـی بیگیریتـەوە تـا تومـاری بکەین.. ئەوانەی تو دەیلی‌ی هەموویان حەقیقەتن بـەواقیعی روویـان داوە بەلام رووداویك لەخەلکی شاراوەیە تودی‌ی ئەوەی رووی داوە ئەیگیریتـەوە من داوات لی ناکەم شتیك بلی‌ی کـە رووی نـەدابی، تەنـها ئەوانـەم لیـت دەوی کە رویان داوە و تیپەربوون و ئیمـە ئاگامـان لـە ووردەکاری‌یـەکانی نی‌یە..؟!

- ئی وایە، ئەم رژیمە زالم بوو زور شتی کردووە.. زور خەلکی کوشتووە .. زور خەلکی ئیعدام کردووە لەدوای ئەوەی کە کوشتونی بەحەفارە قەبری کردووە لاشەکانیان تی کردووە .. ئەوەی ئیمە کردوومانە چاکەمان کردووە گەر لاشەی مردوومان داپوشی بیت .. خواش ئەوەی پی خوش بووە کەلاشەکانمان شاردبیتەوە ، خومن نەمکوشتووە من لاشەم داپوشیوە..

*** منیش پیم ووتی تو ئەرکیکی سەرشانی خوتت بەجی هیناوە .. ئیستاش چاکەیەکی گەورە دەکەیت ئەو ئەرکانەی پیت سپیردراون بیانگیرەوە .. کە رەنگە زور شت هەبی تەنها لەنیوان ئیوەو خوادا بیت و کەسی تر نەیزانی ؟!..**

- راستە ، جاری وابووە ئەم حکومەتە زالمە خەلکانیکی کوشتووە و لاشەکەی لەشوینیکدا فری داوە کە دواتر ئیمە دامان پوشیوەو مەگەر تەنها خوابزانی ئەو شوینە کوی‌یە ، رەنگە کەس و کاریشی هەر چاوەری‌ی بن..!

*** کەواتە ئیستا تەئیدم دەکەیت کەدەلیم بەئاشکراکردنی ئەو نهینیانە چاکە دەکەیت..؟**

- بەلی ، بەلی..!

*** چەند سال لەعەر عەر مایتەوە ..؟**

- دوو سال وچەند مانگیك بوو...

*** لەو ماوەیەدا کەلەعەر عەر بووی چی حالەتیکی کوشتن یا شاردنەوەی لاشەی کوژراوت بینی ..؟**

- هیچ .

*** چون .. بەمانا لەو ماوەیەدا دەزگای ئەمن لەعەرعەر کەسیان نەکوشت ؟!..**

- کاکە ئەمن ئەوەنەبوو خەڵك بگرێـت و کویـان بکاتـەوە و بیـانکوژی .. ئیشی ئەمن مراقبە کردنی خەڵك و کوکردنەوەی معلومات بوو گەر کەسێك معلومات لەسەری هەبوایا کە بەجورێك ئیش دەکات لەبەرژەوەندی دەسەڵات نی‌یە دەستگیر دەکراو تەعزیب ئەدرا تاماوەیـەك لەبنکـەکان ئەمایـەوە گـەر ئیعترافی بکردایە ئەیان نارد بو سەرو ترو حوکم ئەدرابـەزیندان یـان ئیعـدام گەر ئیعترافیشی نەکردایە ئەیاننارد بو مدیریەتی ئەمنی عامە لە بەغدا بو لێکولینەوەی زیاتر ..

**- کەواتە لەوی حالەتی کوشتن و ئیعدام کردنت نەبینی ..؟**

- ئیعدام لەوی تەنفیز نەدەکرا مەگەر کەسێك لەژێر تەعزیب دا مردبی .. نا نەبووە.. ئـەوە زیـاتر لەئـەمنی عامـەدا هـەبووە و بەتایبـەت لەسـالەکانی کوتایی شەری ئیران عیراق دا ئەو کاتەی من لەعەر عەر بووم سـەرەتاکانی شەر بوو.

*** ئەی دوای ئەوەی لەعەر عەر گواسترایتەوە بو کوێیان ناردی..؟**

- لەو ماوەیەی‌کە لە عەر عەر بووم چەند جارێك بو دەورات ئەیاناردم بـو عامە لە بەغدا ..

*** دەورەی چی..؟**

- سیاقە .

*** دلنیابم .!؟**

- کاکە من لەترسی خوا هاتووم و لەبـەر خـاتری خـواو لەهـەمان کـاتدا ئەوەی من دەیکەم ئینسانیەتە بویە هـاتووم، درو بـو کـەس ناکـەم ، بـو درو بکەم من پێت ئەلیم ئیشی من سایەقی بووە لەئەمن.!؟

**- ببورە ، دێینەوە سەر ئەوەی کە لەعەر عەر گەراندیتیانەوە ..!؟**

- گەڕاندمیانەوە بو نوسینگەی جوازات لە ئەنبار و دواتر بو ئەمنی عامە لەبەغدا کە ئەوکات (عەلی حسن مەجید) مودیربوو تاکو سالی ٨٤،٨٣ دواتر گواسترامەوە بو ئەمنی (کوت) تاکو روژی ١٩٨٨/٨/١٧.

*** کەی خیزانت پیکەوە ناوە ..؟**

- کە گەڕاندمیانەوە بو ئەمنی عامە لە بەغدا .. ماوەی چەند مانگیك لەوی بووم هەستم کرد لەبەغدا دەتوانم بژیم و خیزان پیکەوە بنیم ، ژنم هینا لەروژی ١٩٨٣/٣/١٥ بوو کە ئاهەنگی بووك گواستنەوەم ریکخست .

*** پیشتر ئەو کەسەت دەناسی کە بووە هاوسەری ژیانت یاخود لەو ماوە کەمەی لە بەغدابووی ئاشنای بوویت و ئەلقەی هاوسەریتیتان گوریەوە ..؟**

- کچی مامی خوم بوو بەلام پیشتر نە بینیبووم و نە دەمناسی ..

**- کە کچە مامی خوت بوو بوچی وا لەیەکتر دابرابوون نانەیناسی..؟**

- مامم کاتی خوی لەبەغدا ژنی هینابوو کەوتبووە بەغداوە وئیمەش لە (ئوم ریعان) بووین ئەو کات دونیا وەك ئیستا نەبوو هاتو چو کردن کەم بوو کە یەکی بو شوینیکی دوور باری دەکرد ئیتر بەزەحمەت ئەیتوانی هاتوچوی ناو کەس و کاری بکات .. مامم هەر زوو بەو شیوەیە لەباوکم دابرابوو ئیمە کاتیك مالی مامان دوزیەوە لەمیژبوو مامم کوچی کردبوو .. کاتی کە مردبوو دوومندالی لەپاش خوی بەجی مابوو ئەوانیش گەورە بووبونو شویان کردبوو .. من کاتی بەوەم زانی کچە مامەکەم لە پیاویکی تر ٦ منالی هەبوو .. میردەکەی تەلاقی دا لەیەکتر جیابوونەوە ئەو کات من مارەم کرد ..

*** کەواتە بەر لەوەی بیتە هاوسەری تو، پیشتر شووی کردبووە کەسیکی ترو خاوەنی ٦ منالَ بوو..؟**

- بەلی.٦ منالی هەبوو..

*** تو ئیستا خاوەن چەند منالی ..؟**

- شەش منـاڵ.

*** کەواتە شەش منالی لەمیردەکەی تری هەبوو شەش منالیش لەتۆ؟!**

- بەلی..

*** ئەکری بەپێی ساڵ و رەگەز ناوەکانیان بلیی .. مەبەستم منالەکانی خۆتە؟**

- بو نا ..؟ چوار کورو دوو کچم هەیە یەکەمیان کچە ناوی (ئیڤان)ە لەسالی ١٩٨٤ لەدایك بووە دووەم جار لەدوای ئیڤان دوومندالمان پیکەوە بوو کوریك و کچیك (ئەحمد و سوزان) لەسالی ١٩٨٥ لەدایك بوون سەلام لەسالی ١٩٨٦ و موعتەز لەسالی ١٩٨٧ و پیش مانگی ٣ی سالی ١٩٨٨ کوریکی ترم بوو ناوی (حەیدەر)ە ئەو بچوکترینیانە..

*** ناوی دووان لەمندالەکانت کوردین (ئیڤان و سوزان) چون ئەو ناوە کوردیەت لیناوە ..!؟**

- من برادەرم هەبوو کورد بوون ئەم ناوانە ئەو برادەرە کوردانەم پییان ووتم .

*** منالەکانت خستوتە بەرخویندن..؟**

- بەلی هەموویانم سەرەتا خستوتە قوتابخانە بەلام خویندنیان تەواو نەکردووە..

*** بو دەرفەتی ئەوەت بو نەرەخساندوون کە خویندن تەواو بکەن ..؟**

- کچەکانم سەرەتاییان تەواو کردووە پاشان دەرچوون . کورەکانیش (احمد) سەرەتایی تەواو کردووە پاشان وازی هینا .. ئیستاش (موعتەز) لەپولی یەکەمی ناوەندی یەو حەیدەریش شەشی سەرەتایی بەلام نازانم ئەوانیش ئەتوانن خویندن تەواو بکەن یان وەك براو خوشکەکانیان دەبی واز بهینن ..

*** ئەتوانی هوکاری وازهینانیانم پی بلیی..؟**

- لەبەر کەمدەرامەتی بووە ، ژیان قورسە لیرە .. ئەو مووچەیەی من وەرم گرتووە هەر بایی ئەوەبوو پی‌ی بژین ژیانیکی ساکار نەمتوانیوە مەسرەفی ئەو منالانە بکەم بو قوتابخانە .. احمد ی کورم کەوازی هیناوە لەبەر ئەوە بووە ئیستا پیلاو بویاخ دەکات وا دوسالّ زیاترە ئەوە کاریەتی ..

*** ببورە ، هەست دەکەم کەباسی تایبەتمەندیەکانی خیزانەکەت دەکەی خەریکە بریندارت دەکەم ، لەبەر ئەوە لەو باسە بگەری .. ئەو ماوانەی کە لەئەمنی عامەی بەغا بووی کە بی گومان ئەمنی عامەی بەغا وەك قەسابخانە وابووە گەر هەندی ووردەکاری ئەمنی عامەمان بو بگیریتەوە ..؟**

- وەلا ، نازانم ، باسی چی بکەم تو خوت ئاماژەت بەوە کرد کە وەك قەسابخانە بووە .. من تەئیدت دەکەم وەك قەسابخانە بووە بەلام قەسابخانەی مروڤ نەك ئاژەلّ ..

*** گەر هەندی نموونەمان بدەیتی لەسەر ئەو تاوانکاریانەی کەلەوی ئەنجام دراون و تو خوت بینیوتەو شایەتحالی رووداوەکەیت ..؟**

- نەك من هەرکەسی لەئەمنی عامە بووبی ئەوە دەزانی کە لەوی چی رووی دەدا ... مروڤی تیا کەولّ دەکرا .. دەیان .. دەیان ئامرازی تایبەتی هەبوو بو تەعزیب دان زور جیهاز هەبوو کە تەعزیبی خەلکی پی ئەدرا ئەو جیهازانە لەدەرەوەی عیراقەوە دەهاتن ..

*** لەچ وولاتیکەوە دەهینران..؟**

- کی ئەوە دەزانی .. سایەقی سەیارەیەك نهینی ئەوەی دەخریتە بەردەست .. ئەوە تەنها بەرپرسە گەورەکان دەزانن ..!

*** شیوازەکانی تەعزیب دان چۆن بوو؟**

- من نازانم .. خومن کارم تەعزیب دان نەبووە.. مـن جـەلاد نـەبووم مـن سایەق بووم سایەق ..!

*** ئەزانم سایەق بووی بەڵام کە لەدەزگایەك دا کارت کردبـی بێگومـان بەشێك زانیاری دەربارەی ئەو دەزگایە دەزانی ..؟**

- من پێیم وتی و سەرەتا سوێندم بو خواردی کە چی بـزانم دەیگێرمـەوە ، چیم بینیوە ئەوە دەڵێم من لەترسی خوا بەپێی خوم هاتووم تا ئـەو راسـتییە شـاراوانە ئاشـکرابکەم ، نـەزیاد دەڵـێم نەکـەم ، خـوایش خـوی لەسـەرم ئاگادارە..

*** باشە وەك خوت نەتبینی ئەی نەت بیستووە یان برادەرێکت بـوی بـاس نەکردووی ..؟**

- چی ..!

*** لەبارەی ئەو تەعزیب دانەوە ..!؟**

- چون نەم بیستووە .. دەیان شتم بیستووە .. بـەڵام مـن لەسـەرەتادا پێـم ووتی ئەوەی خوم بینیومە ئەوە باس دەکەم ..

*** گـەر ئـەوەی دەربـارەی شـێوازی تـەعزیب دان بیسـتووتە ، یـەك دووحاڵەتمان بو باس بکەی ..؟ ئەوەی کە بویان باس کردووی ..؟**

- تـەعزیب هـەبووە بـو ئـەوە بـوو اعـتراف بەکەسـێك بکـەن بەشـێوەیەك ئازاریان داوە کە ناچاری بکەن ئەوەی دەیزانی بیڵی .. هەبووە بو ئەوە بووە .. بەدەم ئازارەوە بیکـوژن شـێوازی تـەعزیبی ئـەم جیـاوازبوو لـەوی تـر .. یـان هەبووە مروڤیان پارچـە پارچـە کـردووە .. هـەبووە بەراکیشـان پچراندوویانـە هەبووە شەری دەروونی لەگـەڵدا کـراوە کـەس و کاریـان هێنـاوە ژن و منـاڵ بەبەرچاویـەوە ئازاریـان داوە هـەتا هـەبووە تـەعدای شـەرەفیان لی کـردووە.. هەرچی بڵێی کراوە .. کـەمن خـوم ئاگـاداری ئەوانـەنیم مـن ئـەوەی ئاگـام

لیبەتی و شایەتیم لەسەری ئەو کوشتن و لەگۆرنانەی ئەنفالەکانــە ، تــو ئــەوە لەمن بپرسە ..

*** ئەوە دەپرسم ئامانجی سەرەکی ئیمەش لەم دیدارەدا ئەو شــایەتیەی تویە لەسەر ئەنفال ، بەڵام دەمویست سوود لەو زانیاریانەی تر وەرگــرم کــە دەیزانی دەربارەی کوشتن و ترس و توقاندن لەعیراقدا .. ئیستا دیمە ســەر ئەنفال و دەپرسم چی دەربارەی ئەنفال دەزانی ..؟**

- جا چی نازانم ... ئەوەی بەچاوی خوم بینیم هەموویم لەیادماوە ..

**- ئامادەی بومانی بگیریتەوە .. چیت بینی ..!؟**

- بەلی ئامادەم بوتی بگیرمەوە و مقابەلە بکەم و هەرچی تەلـەفزیون و راگەیاندنی دونیاش هەیە ئامادەم لەبەردەمی هەموویان دا ئەوەی بینیومە بیگیرمەوە و ئامادەم لەمەحکەمەی دەولی شایەتی بدەم وە سویند ئەخوم بــە خوا کە ئەوەی راستی بیت ئەو دەگیرمەوە چاوم کویربی ئەگەر دروی تیابکەم و دروش بو کەس ناکەم تەنها لەترسی خــوا هــاتوم و مــاوەی (١٥) سالیشــە هەموو شەوی وەك فیلمی ڤیدیو کوشتن و لەگورنانی ئەو هەموو ژن و منالە دیتەوە بەرچاوم کە منالی (٣٥) روژەی تیابوو کە بــە شــوفلّ خولــم کــردووە بەسەریدا .

***کاتی پەلامارەکانی ئەنفال دەستی پیکرد تۆ لەکوی بووی؟**

-من نازانم ئەنفال کەی دەستی پیکرد..! تا بزانم ئەو کاتــە مــن لــە کــوی بووم !

***ئــەنفال وەك کردەیــەکی ســەربازی لــە ١٨ای شــوباتی ١٩٨٨ دەســـتی پیکرد..!؟**

-من ئەو کاتە لە ئەمنی ( کوت)بووم !

***ئەی چۆن و کەی گواستراینەوە بۆ ئەو ناوچانەی پەلاماری ئەنفال کرابوە سەریان و چۆن بەشداری ئەنفالت کرد..!؟**

-من لە رۆژی ١٩٨٨/٧/١٧ بە فەرمانێك لە ئەمنی (کوت)ە وە گوازرامەوە بۆ (مکتب تنظیم شمال)

***ئەو فەرمانە لەلایەن کێوە درابوو...بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی کوت یان جێگەیەکی تر ..!؟**

- لەلایەن (مدیریەتی ئەمنی عام)ە وە دەرچوو بوو..!

***فەرمانەکە تەنها بۆ گواستنەوەی تۆ بوو..!؟**

-نەخێر، سەرەتا ئەموت هەر مودیریەتێك شۆفل و حەفارەی خۆی هەبوو ئەی ئەموت هەر مودیریەتێك چەند سایەقێکی خۆی هەبوو بۆ شۆفل و حەفارەکان..! فەرمانەکە لە ئەمنی عامەوە بوو بۆ گواستنەوەی چەند شۆفیرێك لە مودیریەتەکانەوە بۆ رێکخراوی باکور کە ئەو کاتە (علی حسن مجید) بەرپرسی بوو.

***لە مودیریەتی ئەمنی کوت چەند شۆفیر بەپێی ئەو فەرمانە گوازرانەوە..!؟**

-لە کوت تەنها من..!

***لەسەر داوای خۆتان بوو کە لەنێو شۆفیرەکاندا کامتان بچن ، یاخود لەلایەن مودیریەتەکانەوە دەستنیشان کرا..؟**

-نە لەسەر داوای خۆمان و نە لەسەر دەستنیشان کردنی مودیریەتی خۆمان بووە هەر ئەو فەرمانەی (ئەمنی عام)ە کە هاتبوو ناوەکە دەستنیشان کرابوو کە لە مودیریەتی ئەمنی (کوت) عبدالحسن و بۆ نمونە لە مودیریەتی ئەمنی (نەجەف) فرحان و ئاوا هەر مودیریەتێك ناوەکە داوا کرابوو..!

*** کەواتە تۆ لەلایەن مودیریەتی ئەمنی عامەوە بۆ ئەو کارە هەلبژێردرابوی..؟**

-بەلی..!

***تۆ کە لە دەزگای ئەمن بووی چی پلەیەکت هەبوو..؟**

-من تەنها وەك فەرمانبەریك و پیشەکەم شۆفیری بوو..

***من پرسیاری پلەم کرد نەك پیشە، چی پلەیەکت هەبوو..!؟**

-ئەو کاتە هیچ پلەیەکم نەبوو، دواتر بووم بە مفەوەز..!

***ئەی لە حزبی بەعسدا ئەندام بووی..!؟**

-کە دامەزرام بوم بە بەعسی..!

***مەبەستت کام دامەزراندن، سەرەتای دامەزراندنت لە ١٩٧٨ مەبەستت ئەو کاتەیە..!؟**

-بەلی ئەو کاتەی دامەزرام بووم بە بەعسی چونکە گەر بەعسی نەبومایە دانامەزرام ئەوەی بەعسی نەبوایە چۆن ئەیانهیشت لە و دەزگایەدا بمینی.

***ئی کەواتە تۆ لە ئەنفالدا (١١) سال بوو چوبویتە ناو ریزەکانی بەعسەوە ، چی پلەیەکی حیزبیت هەبوو..!؟**

-هیچ تەنها ئەندامیك بووم..!

***بۆ کە لەلایەن مودیریەتی ئەمنی عامەوە بۆ ئەو کارە دەست نیشان کرای دەبێ هۆکاریکی هەبی یان پلەو سیقەی ئەمنی یاخود پلەی حیزبیت..ئەگینا چۆن بۆ کاریکی وا کە بەلای بەعسەوە گرنگ بوو کەسیکی وەك تۆ دەلیی ئاسایی دەنیردریت..!؟**

-نا هیچ پلەیەکی بەعسیم نەبوو..چونکە ئەو کاتەی کە دامەزرام کردمیان بە بەعسی و ئیتر دواتر کە گوازرامەوە بۆ شارەکانی تر هیچ

عیلاقەیەکی حیزبیم نەما ..بەعسی بوون تەنها بۆ دامەزراندنەکە گرنگ بوو نەك لە کارەکانی تری ئەمن دا..

***ئەی خۆت هۆکاری ئەو هەلبژاردنەت بۆ ئەو کارە بەچی دەزانی..!؟**

-هۆکاری تەنها ئەوەبوو کە شۆفیری(شۆفل و حەفارە) بووم و دەوراتم بینی بوو دەوراتی ئالیات..

***باشە بەلام خۆ بەتەنها تۆ دەورەت نەبینی بوو..!؟**

-راستە،بەلام هەر کەسیکیان هەلبژاردایە هەر وەك یەك بوو.. ئەوەی گرنگە ئەوان سایەقی شۆفلیان دەویست و ئیمەش سایەق بووین ئیتر جیاوازی لە نیوان (زید و عەبد)دا نەبوو..نازانم ئەم پرسیارانە چیە من خۆم هاتووم پیتان ئەلیم حالەتیکی وا هەیە.. ویژدانم منی هانداوە ئەم راستیە بدرکینم خۆ بە تەعزیب ئیعترافم نەکردوە تا بتەوی هەر پرسیار بکەی و چاوەریت بی من شتی تر بلیم..!

***دلتەنگ مەبە،ئەم باسە هەزاران پرسیار لە خۆ دەگری.. هەزاران هەزار کەس چاوەریی وەلامەکانی تۆن، دەمانەوی ورد و درشتی ئەو کارەساتە لە خۆتانەوە ببیستین..!؟**

-نا، ئیعتیادیە بەلام هەندی شت هەیە پەیوەندی بە منەوە نیە..

***باشە، دوای ئەوەی فەرمانی گواستنەوەت دەرچوو کەی پەیوەندیت بە (مکتب تنظیم شمال)ەوە کرد..؟**

-کە فەرمانەکەمان بۆ هات داوا کرابوو بچینە (ئەمنی عامە) و لە ویوە بەریخراین بۆ مکتب تنظیم شمال لە کەرکوك..

***بیرت نیە چی رۆژیك بوو..؟**

-با، رۆژی ١٩٨٨/٧/٢١ بوو..

***هەر خۆت بوی یا هاوریت هەبوو..؟**

-چەند شۆفیریك بوین کە هەریەکەمان لە مودیریەتیکی ئەمنەوە هاتبوین..

*ناوی شۆفیرەکانی هاوریت لەبیرە..؟

-فرحان جابر خەلکی نەجەف بوو هەر لە مودیریەتی ئەمنی نەجەفەوە هاتبوو.. سەعدی ناوی باوکی نازانم لە مودیریەتی ئەمنی بەغداوە هاتبوو.. ئەحمەد ئیسماعیل خەلکی تکریت و لە مودیریەتی ئەمنی تکریت و عەلی لە ئەمنی دیوانیەوە هاتبوو..هەر ئەو رۆژە گەیشتینە کەرکوك براینە بارەگای مکتب تنظیم شمال و لەوی وە بردمانیان بۆ عەمباری کەرەستەی خۆراك لە سەر ریگای بەغدا لە کەرکوك کە حالی حازر گەراجی گواستنەوەی نەفەرە.. لەوی چەند حەفارە و شۆفلیکمان بینی لەگەل هەندی گەلابەی ئەلبی و تریلەی عەنتەر ناش کە ژمارەکانیان حکومی بوو بەناوی (اسکان)ە وە سەر بە کۆمپانیای ( ئاشور) بوو.. بردمانیانە ناو بیناکە نهۆمی خوارەوەی (سەرداب)بوو ئیمە لەوی بوین و لە نهۆمی سەرەوەش هەمووی (ئەفسەر) بوون..

*ئەو شوینە سەر بە کوی بوو.. کی بەر پرسی بوو..؟

-بەرپرسەکەی( رائد عبد) بوو هیزیکی لیبوو کە هەر سەر بە مکتب تنظیم شمال بوون..ئەوانیش بۆئەو کارە لەویبوون..

*ئیوە چەند رۆژ لەوی مانەوە ..؟

-وابزانم بیست رۆژ تا ١١/٨ تا ئەو کاتە هەر لەوی بوین..

*ناچونە دەرەوە بۆ ناو شار..؟

-نەخیر، چونکە کەسیك هات بە ناوی (رائد نەزهان تۆغان) کە فەرماندەی سریەی پاسەوانی( علی حسن مجید) بوو، پیی وتین کەس نەچیتە

ناو شارەکە لەبەر ئەوەی ناوچەکە ناوچەیەکی کوردیەو کوردەکان ئەزانن ئیوە سەر بە دەزگای ئەمنن ئەتانکوژن..!

***برواتان بەو قسەیەی (رائد نزهان توغـان) کـرد کـە گـەر بچنـە بـازار کوردەکان ئەتانکوژن..!؟**

-نا ، ئەترساین چونکە ئەوان پیشتر لە کەرکوک بـوون و دیـاربوو ئاگایـان لە وەزعی ناو شاری کەرکوک هەبوو.

***کەس پرسیاری نەکرد بۆچی کوردەکان ئەتانکوژن..!؟**

-نا ، نا.. کی ئەیویرا پرسـیاری وا بکـات.. ئـەوان سیاسـەتیکی سـەیریان هەبوو جاری وابوو دونیایان بچـوك ئـەکردەوە لەبـەر چاومـان جـاری واشـبوو ئەمانیان ترسان..

***ئەتوانی زیاتر بۆم رونبکەیتەوە مەبەستت چیە..!؟**

-بلیین بۆ شـتی مەبەسـتیان بوایـە بمانترسـینن قسـەی وایـان ئـەکرد کـە خەریك بوو بتۆقیین وەك ئەو ماوەیەی کە لە کـەرکوك بویـن ئـەیان وت هـەر بچنە بـازار کوردەکـان بـە چـەقۆ ئـەتانکوژن یـان بـە چـەك یـان بـە سـەیارە ئەتانرفینن... ئەگەر بۆ شتی مەبەستیان بوایە نەترسیین ئەوە تەشجیعمانیان ئەکرد کە نەترسین..

***وتت تا رۆژی ٨/١١ بەو شیوەیە ماینەوە.. ئەی دوای ئەوە..!؟**

-رۆژی ٨/١١ رائد نزهان بە ئوتۆمـبیلیکی جۆری لاندکروز هات لەگەل رائد عبد قسەی کرد و بردیە پەنایەکەوە.. دوای ئەوە لەناو شۆفیرەکاندا (مـن و فرحان) بانگ کراین و کەسیك کە سریەی حیمایەی( علی حسن مجید) بوو لەگەلمان دانرا کە بە ( حەفارەکان)بە ریکەوتین .. هاتین بۆ (ئـەم شـوینە وا ئیسـتا مقابەلەکـەی لیدەکـەین و کـاتی خـۆی ١٥ سـال پـیش ئیسـتا ئیمـە

ئەنفالەکانمان تیا نایە چاڵ).. کە هاتین لاندکرۆزەریك وەستابوو لەم شوینە ، رائد نەزهان و رائد عەبد بوون خۆیان لە شوینەکە بوون ..

***کاتی خستنیانە ری هیچ پرسیارتان نەکرد بۆ کوی ئەچین یان چی ئەکەین..!؟**

-نەخیر.. کی ئەتوانی پرسیار بکات .. ئیمە سایەق بوین سایەق تەنها جیبەجیکردنی فەرمانەکانمان لە ئەستۆ بوو..

***کە گەیشتنە ئەوی هەردوو رائد نەزهان و عەبد لەوی بوون چیان پی وتن..؟**

-سەرەتا هیچیان بە ئیمە نەوت خۆیان هەر بەیەکدا ئەهاتن قسەیان ئەکرد و دەستیان بەملاو ئەو لادا دریژ ئەکرد و دوای ماوەیەك وتیان دەست بە هەلکەندن بکەن..

***کی پیی وتن..؟**

-نالیم رائد نەزهان و رائد عەبد..

***ئی، ئیوەش یەکسەر دەستان بە هەلکەندن کرد..!؟**

-ئا ،سەرەتا وتیان بەشیوەی چوار گۆشەیی چاڵ بکەن ، کاتیك کارمان کرد وتیان نا بە شیوەی سندوقی هەلیکەنن..!

***جگە لە تو و فەرحان و رائد نەزهان و عەبد، کیی تر لەوی بوون..؟**

-دەیان پاسەوانی تایبەتی سریەی حیمایەی علی حسن مجید لەوی بوون..

***بۆ علی حسن مجید خۆی لەوی بوو وا دەیان پاسەوانی هاتبوون..؟**

-نەخیر، حیمایەی شوینەکە و حەفارەکان و رائد نەزهان و رائد عەبد بوون..

***کاتی هاتنە ئەم شوینە و ئەو پاسەوانانە و رائدەکانتان بینی .. نەتوت ئەبی بۆچی ئیوەیان هینابی.. ئەو پرسیارەت لەخۆت نەکرد..؟**

-نەخێر چونکە ئەمزانی کاریکیــان لـەم چۆلەوانیەداهەیـە بۆیـە ئیمـەیان هیناوە و چالی لیدەکەن..

***قەناعەتت وابوو ئەو چالانەیان بۆ مرۆڤ بی یا بۆچونی ترت هەبوو..!؟**

-سەرەتا وا هەستم ئەکردکە کاریکی تریان هەبی بەلام کە هاتینە ئیرە و ئەم ناوچەیەم بە چۆلی بینی ، ترسام وتم دیارە شــتی هەیە چونکـە ئەوکاتـە ئیرە چۆل بوو تەنانەت ئەم دیهاتانە لیرە دروست نەکرابوو ئەم باغ و دەغل و دانانە نەبوو هەمووی چۆل بوو ، ئــەم دییانــە دواتــر عــەرەبیان بــۆ هینــاوە و دروستیان کردوە..

***ئەی لە فەرحان هاوریت نەپرسی یان نەتدوان کە بزانی ئەو چی دەلی کە لەم چۆلەوانیەدا چالتان پیدەکەن..؟**

-نــەخیر چونکــە ئیمــە هــەر یەکــەمان لەســەر حــەفارەی خۆمــان بویــن و نەمئەتوانی لیی بپرسم ..

***کی شوینەکانی بۆ دەستنیشان ئەکردن تا ئیوەش هەلیکەنن..؟**

-رائد نەزهان خۆی مەسافەکانی دیاری ئەکرد..

***سەعات چەند بوو دەستان بە چالەکان کرد..؟**

-سەعات ٩ی بەیانی..

***تاکەی خەریکی چالکردن بوون..؟**

-تا سەعات ٨ی شەو.

***چەند شوینتان هەلکەند..؟**

-لە بیرمە نزیکەی (٤ بۆ ٥) شوین هەلکـەنرا کـە دریـژی هـەر یەکـەیان (٢٠ تـا ٢٥)مــەتر بــوو هــەر شــوینی قولیەکەشــی دەگەیشــتە ٢،٣٠ تــا ٣ مەتری تیابوو..

***ئەوان پێیان وتن بەو شێوەیە قولی کەن یان خۆتان بە ئارەزوو وا قولتان کرد..؟**

-رائد نەزهان خۆی سەرپەرشتی چاڵ هەڵکەندنەکەی دەکرد ئەو چی ئەوت ئیمە ئەوەمان جیبەجیدەکرد..

***دوای سەعات ٨ی شەو چیتان کرد ..؟ یان چیان کرد..؟**

-کە حەفرەکان تەواو بوو گەراندمانیانەوە بۆ کەرکوك و بۆ هەمان شوینی خۆمان .

***کەواتە ئەو رۆژە واتە ٨/١١ تەنها چاڵتان کرد..؟**

بەلی..

***ئەی کەی ئەنفالەکانتان داپۆشی..؟**

-شەوی دواتر سەعات ١٠ی شەوی ١٩٨٨/٨/١٢

***رۆژی ١٩٨٨/٨/١٢ بیرت لە چی دەکردەوە، یان چۆن ئەو رۆژەت بردە سەر کەتۆ ئیوارەی پیشوو چاڵی مەرگت بۆ کۆمەلێ مرۆڤ هەلکەندبوو...؟**

-لەبەر ئەوەی نەمدەزانی ئەو چالانەیان بۆچییە ، بیرم بۆ هیچ شتی نەچوو، ئیعتیادی ئەو رۆژەم بردە سەر..چونکە کاری نهینی و تایبەت زۆر ئەکرا، زۆ جار دەیان شەو چالیان پیکردوین بۆ شاردنەوەی کەل و پەلی سەربازی و عیتاد و ئەو شتانە. ئەم چالانەی کردیشمان هەستم نەکرد بۆ مرۆڤ بیت، چونکە سەرەتا وتیان بەشیوەی ( چوار گۆشەی گەورە ) و دواتر رایان گۆری و وتیان ( قوول و دریژ ).

***ئەو رۆژە (رائد نزهان) یاخود (تاهر حبوش) یا(عبد) کە سیان نەهاتنەوە بۆ لاتان، بۆ شوینی حەوانەوەتان قسەیەکتان لەگەل بکەن، یاخود بلین خۆتان ئامادە بکەن، ئەم شەو کاریکی گرنگترمان هەیە ؟!**

-نەخێر نەهاتن و کەس هیچی لەوبارەیەوە پێنەوتین و ئیمە هــەموو کـات ئامـادە بویـن، پێویسـتی بــەوە نــاکرد پێشــتر ئاگادارمـــان بکەنـــەوە بـــۆ خۆئامـادەکردن..هەرکاتی ئەوان بیانویستایە ئیمە ساز و ئامادەبوین.

***پێشتر ئەوەتان پێگوترابـوو کـە لـەم حالەتـەدا دەبـی بـەردەوام سـاز و ئامادەبیت، واتە حالەتی نائاسایی راگەینرابوو کەدەبی بەردەوام خۆتان بـۆ ئەنجام دانی کاری گرنگ ئامادە بکەن؟**

-ئـەی مـن لەسـەرەتادا نـەمگوت پیمانیـان گـوت نـابی بچنـە ناوشــار، بەردەوام لەو شوینە بوین کەبۆمان دیاری کرابوو.

***باشە، رۆژی ١٢ای مانگ، کەی لەو شوینەی کە لیی دەمانەوە بردتانیـان بۆ جیگەی بەکۆمەل کوشتنی ئەنفالەکان.؟**

-ئیمـە تـا سـەعات ١٠ی شـەو هـەر لـە شـوینی خۆمـان بویـن، وابــزانم کاتژمیر ١٠ و هەروا چەند دەقیقەیەکی کەم بـوو ( رائـد نزهـان) هـات بـۆ لامـان، ئاگـاداری کردیـن کـە بـۆ ئـەنجامدانی کـــاریکی گرنـــگ لەگـــەلی بەریبکەوین..

***رۆژی پێشتر پێیان گوتبـون کـە ئـەم شـەو بـۆ کـاریکی گرنـگ بـانگ دەکرین..؟**

-نەخێر..!

***ئـەو کاتـەی (رائـد نزهـان) هـات بـە شـوینتان دا، تـۆ بـە ئاگـــابوی یاخەوتبوی، لەوکاتەدا چیت کرد..؟**

-هیشتا کات زووبوو بۆ خـەو، هـەمومـان دانیشـتبوین خـەریکی قسـەی خۆش بووین، چونکە لەو رۆژانەدا دلمان فرە خۆش بوو..

***بۆ دلتان خۆشبوو، بە پرۆسەی ئەنفال..؟**

-نەخێر. من ئەوکاتە هیشتا نەمنەزانی ئەنفال چییە و نەمبیستبوو..!

***ئەی بەچی دلتان خۆشبوو لەو رۆژانەدا..؟**

-هەموو سی رۆژ، چوار رۆژ بوو شەری ئیران عیراق کۆتایی هاتبوو، دلمان بەوە خۆشبوو کە ئیتر شەر تەواوبوو گەلی عیراق پشوویەك دەدەین...ئیدی ترسمان نەما تیابچین و وامان دەزانی ئیتر لە عیراقدا کوشتن کۆتایی دیت..!

***(رائد نزهان) هەرخۆی بە تەنها بوو کە هات فەرمانی پیکردن بەریبکەون..؟**

-نەخیر..چوار یان پینج سەیارەی جۆری (مارسیدس)کە رەنگەکانیان سپی بوو لەگەلی بوون و هەر سەیارەی چوار حیمایەی تیدا بوو..

***لە شوینەکەی خۆتانەوە بەرەو کوی چوون..؟**

-لە ریگەی (کەیوان عەرەفەوە) بەرەو ریگای بەغدا بردمانیان، حیمایەکان لە پیشەوە ئیمەش بەدوویاندا بەرەو جیگە هەلکەندراوەکان، لە نیوان یایچی و تۆپزاوا .

***کاتی بەرەو هەمان ئەو شوینەی دوینی شەو دەیانبردن، هەستت بەچیدەکرد، یاخود پیت وابوو چی کاریکیان بەتۆ هەیە..!؟**

-سەرەتا واهەستم دەکرد رەنگە چالی ترمان پیهەلکەنن، بەلام کە نزیکی شوینەکە بوینەوە ئەو هەستەم گۆرا..

***بۆ..؟ چیت بینی..؟**

-لەبەر ئەوەی ئەو شوینەی کە شەوی پیشووتر ئیمە چالمان کرد، دەوری بەهیزی تایبەت گیرابوو..

***ئەی شەوی رابردوو ..؟**

-نەخیر شەوی پیشتر بەوشیوەیە نەبوو، تەنها ( رائد نزهان و رائد عبد) و پاسەوانەکانی ئەوان بوون.. بەلام ئەوەی شەوی دووەم واتە شەوی ١٢ی مانگ،

هەموو سەر ریگا سەرەکیەکان و بان گرد و تەپۆلکەکان و چوار دەوری ناوچەکە بە فراوانی تەنرابوون..

***هیزەکان.. هیزی چی بوون..ئەمن.. ئیستخبارات..قوات خاسە..جاشی کورد.. یاخود سەربازی ئاسایی بوون..!؟**

-من نازانم چونکە ئیمە تەنها بینیمان هیزیکی زۆر پاسەوانی ناوچەکەن..ئیدی ئیمە چوزانین هیزی چیبوون..قابیلە خۆ سەربازی ئیعتیادی نەبووە کوردی تیابیت سبەی بچیت بیگیریتەوە.. ئەی هیزی تایبەت بوونە، سەر بە ئەمنی خاس یان مەکتەب تەنزیم شیمال..!

***دەتوانی ئەم دیمەنانەم وردتر بۆ باسبکەیت.. یان جوانتر بۆم وەسف بکەیت..!؟**

-وەسفی چیبکەم (جەریمە) وەسفی تیایە..من ئەلیم کوردیان کوشت تاوانیان کرد، بە بەرچاوی ئیمەوە..من (موجریم) نیم تا تاوان و کوشتن لام رەوابی و لەلام ئاسایی بیت تا وەسفی بکەم..!

***ببورە بەهەلە لیم تیمەگە، کە دەلیم وەسفم بۆ بکەی، مەبەستم بە وردی گیرانەوەی ئەوەیە کە ئەنجام دراوە بە بەرچاوتەوە باسی بکە..!؟**

-ئی، ئەی من بۆچی هاتووم لیرە دانیشتووم .. ئەی مەبەستت ئەوەنییە، ئەوەی بینیومە بۆتی بگیرمەوە..!

***زۆرباشە.. نازانی کاتژمیر چەند بوو گەیشتنە شوینی رووداوەکە .. جیگەی چالەکان..؟**

-نا، نازانم، بەلام تۆ حیسابی ئەوەبکە، ئیمە لە سەعات ١٠ی شەو لایدابوو لە ناو کەرکوك بوین، ئیتر بزانە تا ئیرە چەند دەکات..!

***گوتت سەر ریگا سەرەکی و کرد و تەپۆلکەکان هەمووی هـیزی لیبـوو.. ئەی جگە لەو هیزانە هیـچ بەرپرسـیک، ئـەمنی، سـەربازی، یـا گەسـیک لـە شوینی نادیارەوە هاتبی لەوی‌ئامادە بووبی..؟**

-با، جگە لە (رائد نزهــان) کـە خـۆی هـات بەشـوین ئیمـەدا و هـەر لـە پیشمانەوە دەرۆی، کاتی گەیشتینە ئـەوی لەسـەر ئـەو (تەلـە) گـردەی دیـار چالـەکان ( تـاهر جلیـل حبـوش) کـە ئـەو کــات بەریوەبــەری نوســینگەی ریکخراوەکانی باکوور بوو، دواتر بوو بــە پاریزگـاری ئـەنبار و دوای ئـەوەش بوو بە بەریوەبەری موخابەراتی عامەی عیراق، ئەو لەوی راوەستابوو..

***کە گەیشتن چیتان کرد ..؟**

-ئیمـە چـاوەریی فـەرمان بویـن، چاوەریمـان بـوو بزانـین چـی کاریکمـان پیدەسپیرن..

***بەر لەوەی هیچ کاریك بە ئیوە بسپیرن .. چیتان بینــی .. یـاخود چـی رویدا..بە بەرچاوتانەوە، کە ئیوە تەنها بینەر بوون..!؟**

-دەزانم دەلیـی چـی، لەهـەمـوو شـتیکدا هـەر بینـەر بویـن و ئـەوەی کـە خۆشمان کردومانە فەرمانیك بوە و جیبەجیمان کردوە..

***من پرسیاری ئەوەم کرد چی بە بەرچاوتانەوە رویدا..باسی دەستنیشان کردنی تاوانبارم نەکرد ..؟**

-ئەوەی کە رویدا هەمومان بینی..

***وەك..!؟**

-وەك کوشتنی گەنجە کوردەکان..

***کە ئیوە چوون گەنجە کوردەکــان لـەوی بـوون..ئامـادە کرابـوون بـۆ گوللەباران کردن..؟**

-نەخێر، کە ئێمە چوین نەمگوت هێزێکی پاسەوان و (تاهیر) و رائد (نزهان).. لەوێبوون.

***کەی ئەنفالەکانیان هێنا بۆ شوێنی گوللەباران کردنەکان..؟**

-پێش ئەوەی ئەنفالەکان بهێنن تیمی تایبەتی گوللەباران کردنەکەیان هێنا..

***تۆ تیمەکەت بە چاوی خۆت بینی..؟**

-بەڵێ..

***کاتێ تیمەکەیان هێنا، تۆ لەکوێی چاڵەکانەوە بوی.. چەند لە تیمەکەوە دوور بووی..؟**

-هەموومان هەر بەیەکەوە بوین..

***دەزانم پێکەوە بوون..بەڵام تۆ لەسەر شۆفڵ بووی، چەند لە (تاهر حبوش) و رائد (نزهان) و ئەو تیمەوە دوور بووی کە بۆ گوللەباران کردن هێنرابوون..؟**

-هیچ دوور نەبوم، چونکە ئێمە شۆفڵەکانمان راگرتبوو کوژاندبومانەوە، خۆمان بەپێی لە دیار چاڵەکان وەستابوین..

***کەواتە ئەوەندە نزیك بووی لێیان.. ئێستا ئەزانی جۆری جلوبەرگەکەیان و تفەنگەکانیان چی بوون..؟**

-جلی سەوزی زەیتونیان لەبەردابوو، هەموو دەمانچەیان بەدەستەوە بوو..

***ئەی تفەنگی تر ..؟**

-نەخێر تەنها دەمانچە..

***کەواتە ئەنفالەکانیان بە دەمانچە کوشت..؟**

-ئەو کۆمەڵە بەڵێ..

***تیمی گوللەباران کردنەکە (ئیعدام)، سەروچاویان داپۆشرابوو..؟**

-نەخێر.. ئاسایی بوون..

***کەواتا.. گەر سەروچاویان دانەپۆشرابی و تـۆش لییانـەوە نزیـك بوبـی شیوەیانت لەبەر چاوە..؟**

-نەك شیوە .. کۆمەلیکیانم هەر دەناسی ..!

***چۆن دەتناسین..؟**

-ئەو بیست رۆژەی لەوی بوین، ئەو ئەفسەرانە بەردەوام لەو نـاوە بـوون و دواتریش ماوەیەك من هەر لەوی بووم، بۆیە دەیانم ناسی..

***ئەتوانی پیمان بلیی کی بوون..!؟**

-من پیم وتیت ئەو شتانەت بـۆ بـاس دەکـەم کـە پـەیوەندیان بەخۆمـەوە هەبوە..ئەو شوینانەی گۆرەکانی لییە ..تۆ ئیسـتاکە بـەمن دەلیـی کـی بـوو، سبەی جاریکی دی دەلیی خەلکی کوی بوو، رۆژیکیـش یەخـەم پیدەگـری و دەلیی نازانی لەکوییە..

***منیش پیم وتی تۆ و هاوشیوەکانت شایەدییەکەتان گرنگــە بـۆ دادگـای نیودەولەتی، ئەگینا بە چەکی ئەتۆمیش لەعەرەب بدەین تۆلەی ئەنفالـەکان ناکەینەوە..!؟**

-بۆ عەرەب..خۆ عەرەب هەموو تاوانبار نییە.بەعس کەمی بە عەرەبی خوار و نەکرد ( شیعەکان ).

***با لەباسەکە دەرنەچین..من وەك گوتم ئەو ناوانە بۆ شـایەدی گرنگـن نەك بۆ تۆلە کردنەوە..؟**

-تیمەکە (١١) کەس بوون کردەوەی گولەباران کردنەکەیان ئـەنجام ئـەدا، مولازمی یەکەم (صائب) مرافقـی علـی حسـن مجیدبـوو، مولازمـی یەکـەم (صائم) خەلکی ئـەنبار بـوو، مولازمـی یەکـەم (سـعود) و رائـد (عبـد) و ژمارەیەکی دی بوون..

***هەر هەمویان چەکەکانیان دەمانچە بوو..؟**

-هەمویان یەك جۆر دەمانچە و هەموشی ( کاتم الصوت) بوو.

***تیمی گولەباران کردنەکە، چیان دەکرد بەر لەوەی دەست بەکارەکەیان بکەن..؟**

-وەك ئێمە لەو ناوە دەسوڕانەوە و چاوەڕوانی نێچیرەکانیان بوون..

***کەی ئەنفالەکانیان هێنا..؟**

-هەر ئەوکاتەی ئێمەیان برد، دیار بوو هێزی تایبەتیشیان ناردبوو بۆ هێنانی ئەنفالەکان، چونکە دوای ئەوەی ماوەیەك بوو گەیشتبوین و تیمی گولەباران کردنەکە گەیشتن، پاش ماوەیەکی کەم دوای ئەوە ئەنفالەکانیان هێنا ..

***بەچی هێنایانن..؟**

-بەسەیارە..

***چی جۆرە سەیارەیەك بوون..؟**

-سەیارەکان وەك ئیسعاف وابوو (موقەپەت) کەمێك لە ئیسعاف گەورەتر و درێژتر بوون..

***چەند سەیارەبوون..؟**

-وابزانم شەش سەیارە بوون..

***ژمارەی هیچ لەو سەیارانەت نەگرت..؟**

-نەخێر، تەماشام نەکرد..

***سەیارەکان هاتنە نزیکی چاڵەکان..؟**

-بەڵێ، هاتنە دیار چاڵەکان..

***خەڵکەکەیان هەموو داگرتە خوارەوە و ریزیان کردن تا کوشتیانن..یان چۆن بوو گەر بۆمانی بگێڕیتەوە..؟**

-بەر لە هەر شتێك، كاتێك ئەنفالەكانیان هێنا بە فەرمانی ( تاهر حبوش ) هەموو سەیارەكان خرانە كار، تەنانەت ئێمەش چوینە سەر شۆفلەكان و پێیان گوتین ئیشی پێبكەن و دەنگی بەرز بكەنەوە..ئیتر ئەو شەش سەیارەیە كە كوردەكانی تێدا بوو هەمویان بەهێزی تایبەتی دەور درابوون، یەكە یەكە هێنرانە دیار چاڵەكان، كە سەیارەیەك ئامادە دەكرا لە دیار چاڵەكاندا لە لایەن ئەو (١١) ئەفسەرەوە كە باسم كرد، دەرگای سەیارەكە دەكرایەوە، دوو پاسەوان لە دەركی سەیارەكە بوون پەلی كوردێكیان دەگرت و دایان دەگرتە خوارەوە و ئەیاندا بەدەست یەكێ لە ئەفسەرەكانەوە و ئەبرانە دیار چاڵەكان و هەریەكی یەك فیشەكی دەمانچەیان ئەنا بەسەریەوە و ئەخرایە چاڵەكەوە..

***پەلەمەكە.. ئەنفالەكان كە لە سەیارەكە دادەگیران دەست و چاویانیان دەبەستەوە، یاخود هەروا بەسادەیی گولەباران دەكران..؟**

-كە هێنایانن هەموویان دەست و چاویان بەسترابوو.. پێشتر ئەو كارە ئامادە كرابوو ..

***لەكوێ دەست و چاویانیان بەستبوو..؟**

-نازانم، لەكوێ وە هێنایانن لەوێ بەسترابوو..

***بەچی بەستبوویان..؟**

-زۆربەیان دەستیان بە ئەو پەڕۆ باریك و درێژە بەسترابوو كە خۆیان لەسەر جلەكانیانەوە لەناو تەڵەنگەیان دەیانبەست .. نازانم چی پێدەڵێن..

***پشتوێن..!**

-ئا،ئا، بە پشتوێنەكانیان دەستیان بەسترابوو یان جامانەی رەش .. چاویشیان بە پەڕۆ بەسترابوو..

***ئەو شەوە، شەوێكی چۆن بوو..؟**

-شەوێکی پر لە تاوان..

***مەبەستم پێناسەی تۆ نەبوو بۆ شەوەکە..تاریکە شەو بوو، مانگەشەو بوو، چی بوو..؟**

-زۆر روون نەبوو، بەڵام تاریکێکی ئەنگوستە چاویش نەبوو..

***گوتت هەر ئەفسەرێك لەو (11)کەسە کوردێکی دادەگرت و ئەیکوشت.. بە ریز بە دوای یەکتریدا ئەم کارەیان دەکرد، یاخود هەر کەسەو بۆخۆی ئەچوو دایدەگرت و ئەیکوشت..؟**

-نەخێر هەرکەس بۆخۆی نەبوو.. ئەو (١١) کەسە، هەریەکی کوردێکیان دەهێنا، لەدیار چاڵەکان رادەوەستان بەریز، چاوەڕێی فەرمانیان دەکرد و هەموویان پێکەوە دەستیان بەتەقە دەکرد و هەموو گوللەباران کراوەکانیش پێکەوە دەکەوتنە چاڵەکەوە..

***کێ فەرمانی دەکرد تەقە بکەن..؟**

-نازانم..

***چۆن ئەبێ نەزانی، ئەی هەمووی بە بەرچاوی تۆ وە ئەنجام نەدراوە..!؟**

-با، هەمووی بە بەرچاوی منەوە بوو، بەڵام ئەوکاتە ئێمە خرابوینە سەر شۆفڵەکانمان و ئیشمان بە شۆفڵەکە دەکرد، بۆیە نازانم کێ بوو فەرمانەکەی دەکرد بۆ دەستپێکردن..

***بە پێوە گولەباران کران..؟**

-نا،نا..هەریەك لەو (١١) ئەفسەرە کە کوردەکەیان بەدەستەوە بوو، لەدیار چاڵەکان دایان ئەنیشاندن لەسەر ئەژنۆ، دەستیان لەپشتەوە بەسترابوو، ئەفسەرەکە پێی ئەخستە سەر دەستی لەدواوە و بەدەستێ سەری گرتبوو، ئەژنۆی دەنایە زەوی و دەمانچەکەیشی لەپشت سەری توند کردبوو، تا بڕیاری تەقەکردنەکەی وەردەگرت..

***هیچ کەس لەو کوردانە هەوڵی خۆ رزگـارکردنی نـەدا، یـان پـەلاماری ئەفسەرەکە بدات، یا روبەرووی بێتەوە، یان قسەیەك بە ئەفسەرەکە بڵێ..؟**

-بۆ قسە گوێم لێنەبوو، بەڵام کەس هیچ هـەوڵێکی تـری نـەدا .. هـەوڵی چی بدەن، ئەوان دەست و چاویان بەسترابوو رەزیل بوون لەبەر دەست زاڵمدا..

***کاتێ تەقەکان کرا و هەر ئەفسەرە و نێچیرەکەی خـۆی کوشـت، چـۆن خستیانە چاڵەکەوە ..؟**

-وەك باسم کرد لەدیار چاڵەکە کوشتیانن، دوای تەقەکە ئەفسـەرەکە ئـەو پێیەی خستبویە سەر دەستی لەپشتەوە، دوای کوشـتنەکەی بەنوکـە شـەقێك هەڵی دەدایە چاڵەکەوە..

***پێت وانەبوو رەنگە بەو فیشەکە نەمردبن و بە زیندویەتی و برینداری لـە چاڵ نرابن..؟**

-رەنگـە سـەرەتا بـەو فیشـەکە نـەمردبن، بـەڵام هـەر بەردانـەوەیان بۆنـاو چاڵەکە، گەر زیندوش بوبێتن ملیانی شکاندوە، ئـێ، ئەگـەر هـەر زینـدوش بوبێ ئێمە خۆڵمان کرد بەسەریدا و دامان پۆشی..

***هەموو ئەو کوردانەیان ئەو شەوە بەو جۆرە کوشت..؟**

-بەڵێ، وەك وتم شەش سەیارەبوون، هەر سەیارەی (٥٠) کەسی تێدابـوو، هەمویان خرانە چوار چاڵەوە و هەر چاڵێ (٧٥) کەس..

***باشە کە دەستەی یەکەم گوللـەباران کـران، هاوڕێکـانی تریـان لـەناو سـەیارەکان، کـە چـاوەڕێی مـەرگ بـوون، چـۆن هـەوڵی رزگـار بـوون و راکردنیان نەدا..؟**

-ئەی پێم نەگوتی دەست و چاویان بەسترابوو.. کێ‌دەڵـێ زانیویشـیانە بـۆ مـەرگیان دەبەن..

***ئەی چۆن، لە تەنیشتیانەوە هاوڕێکانیان گوللەباران نەدەکرا..؟**

-با، بەلاّم دەمانچەکان ( کاتم الصوت) بوون و دەنگی سەیارە و شۆفلەکانیش زاڵبوون بەسەر هەموو دەنگەکانی تردا و رەنگە تا ئەو کاتەی نۆرەی خۆیان نەهاتوە گوێیان لەتەقە نەبوبێ..

***هەموو گولەباران کردنەکەی ئەو شەوە ماوەی چەنێکی خایاند..؟**

-وەلاّهی نازانم، بەلاّم زۆری پێنەچوو..

***ئێوە کەی دەستان بەداپۆشین کرد..؟**

-دوای تەواوبوونی گولەباران کردنەکە، ئێمەش دەستمان کرد بەداپۆشینیان ..

***لەوکاتانەدا کە بەپێش چاوتەوە گولەباران دەکران و دواتر خۆت داتپۆشی، هەستت بەچی دەکرد..!؟**

-بە دڕندەیەتی خۆم..

***ئەی بۆ کردت..!؟**

-منیش وەك ئەوانم بەسەر دەهات، گەر نەمکردبایە..

***کەس پێی گوتن ئەگەر ئەو کارە نەکەن وەك ئەوانتان بەسەر دێنین..!؟**

-سەدان جار..

***کەی و لەکوێ پێیان گوتن..!؟**

-لە کۆبوونەوەکانمان..

***لەکام کۆبوونەوە .. بەر لەوەی کارەکە ئەنجام بدەن کۆبوونەویان پێکردن..؟**

-نەخێر زووتر..

***ئاخر کەی..؟**

-ئەرێ تۆ پرسیاری کوشتنی ئەنفالەکان لەمن دەکەی یان شتی دی .. کاکە، بەعس زاڵم بوو، خەڵك هەبوو هاورێم بوو (پرسە)یان هەبوو، چوار

رۆژ غایب بوە ئیعدام کراوە لەسەر غیابات، ئیتر چۆن لەشتی وادا قبوڵی دەکەن ئەو کارە نەکەین..

***چۆنتان داپۆشین..!؟**

-ئەو خۆڵەی شەوی پێشتر دەرمانهێنابوو، کردمانەوە بەسەریاندا و دامان پۆشین..

***تۆ ئەوە یەکەمین تاوان بوو بەشداری تێدا بکەی..!؟**

-من تاوانم نەکردوە، ئەوانە تاوانبار بوون کە فەرمانەکەیان دەکرد و ئەوانەی وا گوللەبارانیان کرد.. ئێمە دامان پۆشی تاوانمان چییە.. پاشان من خۆم هاتووم خەبەرم هێناوە، خۆ کەس ناوی منی نەهێناوە، گەر تاوانبار بوایەم نەدەهاتم..

***ببورە، یەکەمین حاڵەتی لەو جۆرە بوو بەشداری تێدا بکەی..؟**

-بەڵی..

***ئەی دوا جاریش بوو..!؟**

-نەخێر..

***چ جارێکی دی بەشدار بوی..!؟**

-هەر چەند رۆژێکی تر دوای ئەوە، بەشداریم لە داپۆشینی ژن و منداڵی ئەنفالکراودا کرد..

***لەکوێ..؟**

-لەناوچەی دووز خورماتوو..

***شەوی٨/١٢ دوای ئەنجام دانی کارەکەتان، واتە دوای داپۆشینی ئەو وەجبە ئەنفالە چیتان کرد، مەبەستم تۆ و فەرحانی هاورێتە، ئەو شەوەتان چۆن بردە سەر..؟**

-هەر دوای ئەوەی پرۆسەی گوللە بارانکردن و داپۆشین کۆتایی هات، من و فەرحان و هەموو پاسەوانەکانی دەوروبەریان کۆکـردوە، لـە دیـار چاڵـەکان کۆبوونەوەیـەکیان پێکردیـن و هەڕەشـەیان لێکردیـن کـە لای کـەس باســـی نەکەین.

***کێ کۆبوونەوەکەی پێکردن..؟**

-رائد نەزهان تکریتی.

***قسەکانیت لەیاد ماوە..؟**

-بەڵێ.

***چی گوت..؟**

-وتی: ئەمەتان بەچاوی خۆتان بینی .. ئەوەی ئەم حاڵەتـە لای هەرکەسـێ بدرکێنێ یاخود ورتەی لێوە بێت، ئەوە چارەنوسی خۆتان و خێزانەکانتان بەم شێوەیە دەبێت.

***کەس هیچ قسەیەکی نەکرد..؟**

-نەخێر،کێ دەیوێرا قسەبکات.

***باشە دوای کۆبوونەوەکە چیتان کرد..؟**

-گەڕاینەوە بۆناو کەرکوك بۆ هەمـان ئەو شوێنەی کەپێشتر لێی بوین.

***کە گەڕانەوە، بۆکەستان نەگێڕایەوە کە کارێکی واتان ئەنجام داوە..؟**

-نەخێر، کێ دەیوێرا بیگێڕێتەوە، ئـەی نـەموت رائـد نـەزهان هەڕەشـەی لێکردین نەیگێڕینەوە.

***ئەی هاوڕێکانتان نەیان پرســی لـەکوێ بـوون.. بـۆ کـوێ بردتانیـان. وەڵامتان چی بوو ..؟**

-شـەوی پێشـوتریش لای برادەرەکانمـان وتمـان چاڵیـان پێمـان کـــردوە و ئەوشەوەیش کە گەڕاینەوە هەر وامان گوت..

***بروایان پێتان کرد..؟**

-ئەی بۆ نا، دوای ئەوە ئەوانیش نەیاندەوێرا ئەوەندە پرسیار بکەن.

***ئەو شەوە بەلاتەوە شەوێکی ئاسایی بوو..؟**

-ئاسایی چی.. من پێتم گوت ١٥ ساڵە وەك کاسێتی ڤدیۆ هەموو شەو دێتە بەر چاوم تا ئێستاش لەبەر دەم ئازارێکی توندی دەروونیدام چیجای ئەوشەوە.

***ئەو شەوە نوستی..؟**

-نەخێر.

***ئەی فەرحان هاورێت..؟**

-نازانم، بڕوا ناکەم ئەویش خەوی لێکەوتبێت.

***ئەو شەوە بیرت لە چیدەکردەوە...خۆزگەت نەدەخواست کەبتوانی لە دەستی رژێم هەڵبێت و ئەو روداوە بۆ دنیا بگێڕیتەوە..!؟**

-لەبەر ئەوەی سەرەتا نەمانزانی ئەوانەی گولەباران کران چین و یان چیان کردوە کە گولەباران کران، بۆیە دەموت رەنگە تاوانباربن.. بەلاّم کە شەو دوای پرۆسەی کوشتن و داپۆشینەکە زانیمان کە ئەنفالەکانن، ئەو کات زۆر کاری لێم کرد زیاتر لەوەی کە هەر وەك کۆمەڵێ مرۆڤ سەیریان بکەم.

***گوتت دوای پرۆسەی داپۆشینەکە زانیم ئەنفالکراوەکانی کوردن..! چۆن زانیت..؟**

-دوای ئەوەی کە گەڕاینەوە بۆ شوێنی خۆمان، هەندێ لە حیمایە تایبەتەکان هاتن بۆ لامان و نانیان بۆمان هێنا، ئەوان گوتیان.

***وتیان چی..؟**

-ئێمە پرسیمان ئەوانە چیبوون..گوتیان ئەو کوردانەن کە ئەنفال کراون و لە تۆپزاوا دەسبەسەرن..

***چۆن باستان کرد، یاخود وێراتان باسی بکەن..؟**

-ئەوان نانیان بۆ مان هێنا و لامان دانیشتن قسەمان کرد پێکەوە، لەو کاتانەدا پرسیمان و ئەوانیش وایان گوت.

***تۆ زووتر وشەی ئەنفالت بیستبوو..؟**

-نەخێر ئەو شەوە بیستم.

***بۆ سبەی کە ڕۆژ بوە وە چیتان کرد ..؟**

-سبەی ئێمە مۆڵەت دراین ٣ ڕۆژ بڕۆینەوە ماڵەوە و بیبینەوە.

***چوونەوە..؟**

-بەڵێ.

***ئەتوانی باسی ئەو سێ ڕۆژەم بۆ بکەیت چۆن لەماڵەوەت بردۆتە سەر ..؟**

-تۆ پرسیاری زۆر سەیر دەکەیت..

***من مەبەستم ئەو حاڵەتە دەروونیەیە کە شەوی پرۆسەی ئیعدام کردنەکە نەیهێشت بخەوی..ئەمەوێ بزانم دوای ئەوە چویتەوە ناو ماڵ و منداڵ و ماوەیەك بوو نەچوبویتەوە..ئەو شوێن گۆڕینە ئارامی نەکردیتەوە..؟**

-کە چوومەوە زۆر بێزار و بێتاقەت بووم..مێشکم خەریك بوو ئەتەقی..خێزانەکەم هەستی بەوە کردبوو کە من ئاسایی نیم، زۆر پرسیاری کرد منیش هەمویم بۆی گێڕایەوە.

***ئەی لەوە نەترسای کە شەوی پێشوو هەڕەشەی مەرگتان لێکرابوو گەر بیگێڕنەوە..؟**

-با، بەلاّم لەلایەك ژنەکەم وازی نەدەهێنا و لەلایەکی تریش ئەگەر بۆیم نەگێڕایەتەوە مێشکم دەتەقی.

***دوای گێڕانەوەکە هەستت کرد ئارام بویتەوە..؟**

-کەمێك، بەڵێ.

***ئەی خێزانەکەت چیگوت کە کارەساتێکت بۆ باس کرد دیمەنێکی وەحشی گەریانە بوو..؟**

-ئەویش زۆر بێتاقەت بوو بەلاّم دەسەلاّتمان چیبوو.

***نەیگوت مەرۆرەوە بۆ کارەکەت، یان ئامۆژگاریەکت بکات خۆت لەکاری وا بدزەرەوە..؟**

-قابیلە خۆ ئەو پێی خۆش نەبوو من کاری وابکەم، بەو بوایە من دەوامم لەتەنیشت ماڵی خۆمانەوە بوایە.

***بیرت لەوە نەکردەوە لەو سێ رۆژەدا رابکەی لەدەستی رژێم..؟**

-بۆ کوێ رابکەم.. هیچ شوێنێك هەبوو..خۆ دەرباز کردن نەبوو لە عێراقدا..ژیانی تۆش لەوان خراپتر دەبوو، گەر بیرشت لێبکردایەتەوە.

***دوای سێ رۆژ مۆڵەتەکەت گەڕایتەوە کەرکوك..هەستت نەکرد هیچ شتێك روویدابێ ..؟**

-کاتێ گەڕامەوە، با هەستم کرد زۆر شت گۆڕاوە.

***وەك چی..؟**

-وەك ئەوەی سایەقەکانی دیکەی هاوڕێمان لەوێ نەمابوون.

***ئەی بۆ کوێ برابوون..؟**

-برابوون بۆ نێوان جەبەل حەمرین و دووزخورماتوو.

***ئەی ئێوە چیان پێکوتن..؟**

-ئێمەشیان برد بۆ لای هاوڕێکانی ترمان.

***کە چوون ئەوان چیان کردبوو..مەبەستم لە پرۆسەی چاڵکردن و لەگۆڕنانی ئەنفالەکانە..؟**

-پرسیارمان نەکرد چیتان کردوە..چونکە خێوەت هەڵدرابوو هێزی پاسەوانیش لە ناوچەکە هەبوو..چاڵی ئامادە کراویش هەبوو..ئێمەشیان راسپارد چاڵ بکەین.

***کردتان..؟**

-ئەی چۆن..بەڵێ.

***کەی خەڵکی ئەنفالکراویان بۆ هێنا..؟**

-مێژووی رۆژەکە نازانم.

***چەند رۆژ دوای گەڕانەوەت بوو، لە سێ رۆژی مۆڵەتەکەت..؟**

-ئاخر نازانم، چونکە ماوەیەك لەو ناوچەیە ماینەوە..لەوێوە بۆ شوێنی تر دەبراین هەر لە نزیکی دووزخورماتوو و چیاکانی (حەمرین) هەر چەند رۆژ جارێك حەفارە و شۆفلێیان دەبرد

***من مەبەستم لەو رۆژەیە کە تۆ بەشداریت تێدا کرد..؟**

-بەخوا نازانم بەلاّم تا ٩/١٥ ئێمە هەر ئەو جۆرە کارەیان پێمان کرد.

***کەواتە ئەوەی تۆ ئاگاداربی لە رۆژی ٨/١١ تا ٩/١٥ پرۆسەی کوشتن و لە چاڵنان درێژەی هەبوو..؟**

-ئەوەی من ئاگاردارم، ئا.

***تۆ پێشتر پرسیارم کرد کە یەکەم حاڵەت و دوا حاڵەت بوە بەشداری تێدا بکەی، گوتت نەخێر لە دووزخورماتوو بەشداریم کردۆتەوە..ئەوەم بۆ بگێڕەوە کەیبوو..؟**

-ئەموت مێژووی رۆژەکە نازانم..بەلاّم هەر لەو ماوەیەدا بوو.

***ئەی ئەو هاوڕێیانەی دیکەت جگە لە فەرحان..ئەوان بەشداریان نەکرد لەو پرۆسەیە..؟**

-چۆن نەیانکرد، چەندین شەو ئـەوانیش بـۆ شـوێنی دی برابـوون هـەمان کاریان کرد.

***نازانی بۆ کوێ برابوون..؟**

-نەخێر..بەڵام هەموو ئەوەی بـەو تیمـەی ئێمـە ئـەنجام درابـێ لـە نێـوان( تۆپزاوا و دووز بۆ چیای حەمرین) بووە.

***تۆ بەدەستنیشانکراوی لە چی جێگایەکی دی بەشدار بـووی کـە خـۆت داتپۆشین..؟**

-لە نێوان دووز بۆ حەمرین و نزیك رێگەی دووز بۆ دۆزە.

***ئەوانیش هەر(گەنج) بوون..؟**

-نا، گەنج و پیر و ژن و منالێش بوون.

***بەهەمان شێوەی گەنجەکانی لای ( تۆپزاوا) و (یا یچـی) گوللـە بـاران کران..؟**

-نەخێر ئەمجارە گوللە بارانکردنی بە کۆمەڵ.

***مەبەستت چییە لە گوللەبارانکردنی بەکۆمەڵ..؟**

—هەر بەسەر یەکەوە گوللەبارانکران .. کۆمەڵ، کۆمـەڵ بـە کلاشـینکۆف لێدەدران.

***دەستەی گوللەباران کردنەکە هەمان ئەو تیمەی پێشوو بوون..؟**

-بەڵێ، هەر ئەو(١١) ئەفسەرەی باسم کردن.

***بەچی جۆرە سەیارەیەك ئەنفالەکانیان هێنا..؟**

-هەر بەسەیارەی سەرداپۆشراو(موقەپەت).

***هەر کە هێنایانیان بەپێی تەمەن لێك جیاکرابوونەوە، یاخود ژن و منداڵ و لاو و پیر بەیەکەوە بوون..؟**

-نا، بەجیا هێنایانیان..سەرەتا گەنجیان هێنا بەڵام پرۆسەی گواستنەوەیان خێرابوو هێشتا گوللەبارن کردن و داپۆشینی گەنجەکان تەواو نەبوو ئەوانی دیکەیان هێنا.

***سەیارەکانیان دوور راگرت لە شوێنی گوللەباران کردنەکە، لە چاڵەکان..؟**

-زۆر دوور نەبوو، هەر لەپاڵ ئەو گردە دایانگرتن، چونکە چاڵەکانیش زۆر نەبوون، نێوان گردەکە و دەشتییەکە خۆی چاڵ بوو، لەوێ گولەبارن کران.

***ئێ، گەر بۆم تەواو کەیت..؟**

-پاسەوانی تایبەت لە سەیارەکان دایانی دەگرت و ریزیان دەکرد لە سەیارەکەوە بەرەو چاڵەکە.

***دەست و چاویان نەبەسترابوو..؟**

-دەستیان با، بەلاّم ئەو وەجبەیە چاویان نەبەسترابوو.

***کەواتە بە بەرچاوی یەکتریەوە گوللەبارانکران ..؟**

-بەڵێ، کە بەریز بردیانیانە ناو ئەو مەسافەیەی کە لە نێوان گردەکە و دەشتەکەدا بوو خۆی چاڵێکی فراوانبوو، خرپانیان کردە یەکتریداو دەست بەگوللەبارانکردن کرا.

***فەرمان درا دەست پێبکەن..؟**

-بەڵێ.

***کێ فەرمانی دا..؟**

-رائد عەبد.

***چی ووت..؟**

-وتی رەمی بکەن.

***چەند کەس بوون تیمی گوللەبارن کردنەکە..؟**

-ئی نەمگوت(١١)کەس.

***هەموویان تەقەیان کرد..؟**

-بەڵێ.

***تەقە کەرەکان بەریز وەستابوون و پێشتر ئامادە باشیان وەرگرتبوو..؟**

-بەریز نەوەستابوون، بەڵام ئامادە بوون.

***ئەی چۆن وەستابوون، لە کوێ وە تەقەکانیان دەکرد..؟**

-ئەزانی چۆن بوو، لایەکی شوێنەکە(گرد)بوو گەنجەکان لەوێ خڕکران، ئەملای تریش هەمووی تیمی گوللەباران کردنەکە بوو، کە فەرمانیان پێدرا لە هەموو لایەکەوە تەقەیان کرد و کوشتیانیان.

***کەس هەوڵی خۆ رزگارکردنی نەدا..؟**

-هەوڵی چی، هەموو ئەو ناوە بە هێزی تایبەت دەور درابوو، دوای ئەوە (دە) مەتر لە تیمی گوللەباران کردنەکەوە دوور نەبون، چۆن دەتوانن رابکەن.

***ئەی کە ئەیانزانی وا ئەکوژرێن هیچیان نەکرد..؟**

-نەخێر، تەنها ئەگریان.

***زەلامەکان..؟**

-ئا،ئا، زەلامەکان هاوار و باوکە رۆیان بوو.

***گوتت پرۆسەی گواستنەوەیان خێرابوو، لە کاتی گولەبارانکردنی گەنجەکاندا ئەوانی تر گەیشتن، مەبەستم ژن و منداڵەکانە..؟**

-بەڵێ.. قافڵەی ئەو سەیارانەی دەیانیان هێنا بەدوای یەکتریەوە دەهاتن..سەیارەکان دوور نەبوون لەیەکتری.

***نەتانزانی لە کوێوە دەیانهێنن..؟**

-با..له تۆپزاوا( گەنج و پیرەکان) و له(دبس)ەوە ژن و منالەکانیان هێنابوو.

***که پرۆسەی گوللەبارانکردنی گەنجەکان تەواو بوو..ئێوه بەدوایدا یەکسەر دەستان بەداپۆشین کرد، یاخود چاوەڕوان بوون تا هەموو پرۆسەکە تەواو کرا، ئەوکات داتان پۆشین..؟**

-ئێمە چاوەڕێ بوین تا تەواو بوون.

***هەر یەك تیمی گوللەبارانکردن هەبوون..؟**

-بەڵێ، هەر ئەو(١١) ئەفسەرەبوون.

***ئەی چۆن پێدا رادەگەیشتن..؟**

-بۆ فریا ناکەوتن، ئەوان تەنها ئەرکیان ئەوەبوو پەنجە بخەنە سەر پەلەپیتکەی تفەنگەکانیان وەجبە وەجبە بۆیان ئامادە دەکراو ئەوان دەیانکوشتن.

***کێ بۆیانی ئامادە دەکرد..؟**

-وابزانم ئەوە سێ چوار جاری تر بیلێم.. هێزی تایبەت لەسەیارە دایدەگرتن و بەرەو شوێنی گوللەبارانکردنە..

***پیرەکان دەستیان نەبەسترابوو..؟**

-نەخێر.

***چاویان..؟**

-نەخێر.

***ئەی چۆن وا بەئاسانی ئەچونە بەردەم گوللەی مەرگ..هیچ هەوڵێك نەبوو بۆ تەسلیم نەبوون..؟**

-ئەوان زیندان بوون لەسەیارە دادەگیران و وەك ئاژەڵ ئەدرانە پێش بۆ ئەو شوێنەی کە گوللەباران دەکران..چی دەسەلاتێکیان هەبوو تا بەرگری

بکەن..تەنها هاوار و قیژەیان بوو..دواتـر ئـەوە بەقـەدەر ژمـارەی ئـەو خەڵکـە هێزی تایبەت تەرخان کرابوو بۆ ئەو کارە.

***وەك باسی دەکەیت، حسابکە هەر بە پاڵ خەڵکەکەیان راپێچی بەردەم گوللەکان کردوە..؟**

-ئا، هەر وابوو بەزۆرە ملێ و بە پاڵنان خڕ دەکران و گوللەباران دەکران.

***لەکاتی ئەو گوللەباران کردنەدا، هەر لەترسا مەبەستم ترسی گوللەکانە، کەسێك راینا کرد، یاخود پەنا بۆ سەربازێك بەرێت تا لە مردن خـۆی رزگـار بکات..؟**

-ئەو گوللە وەك لێزمەی باران لە هەموو لایەکەوە بۆیان دەچوو..هەمویان لەترسا وەك مەڕ سەریان دەکرد بەیەکتریدا و خۆیـان ئەدایـە پـاڵ یـەکتری تـا هەمویان بەسەر یەکدا دەکەوتن.

***نەتبینی ژنێ، منالێ.. پیرە مێردێك لە سەربازێك بپاڕێتەوە یـان قسـەی لەگەڵدا بکات نەیکوژن، یاخود بپرسێ بۆ دەیکوژن..؟**

-با، ژنێك لەگەڵ خۆم قسەی کرد.

***تۆ کوردیت دەزانی..؟**

-نەخێر.

***ئەی قسەی چی کرد..؟**

-وتی بۆ دەمان کوژن، ئەو هەموو ژن و منالە گوناهیان چییە.

***چۆن ئەزانی وایگوت..؟**

-بە عەرەبی قسەی کرد.

***بە عەرەبی...... !!؟**

-بەڵێ بە عەرەبی .

***ژنەکە عەرەبی دەزانی..؟**

-خۆی عەرەب بوو.

***چۆن؟ خۆی عەرەب بوو..؟**

-بەڵێ عەرەب بوو.

***ئەی چی دەکرد لەوێ لە ناو ئەو کوردە ئەنفالکراوانەدا..؟**

-ئەویش گیرابوو وەك ئەوان.

***چۆن دەزانی..؟**

-ناڵێم قسەم لەگەڵ کرد.

***ئەو خۆی گوتی من عەرەبم..؟**

**-کە بە عەرەبی قسەی کرد هەستم کرد عەرەبییەکەی تەواوە، بەلامەوە سەیر بوو کە ئەو عەرەبییە دەزانێ، من لەوم پرسی چۆن وا عەرەبی دەزانی، گوتی عەرەبم.**

***نەیگوت چۆن گیرام..؟**

**-با، گوتی عەرەبم خەڵکی(حله)م..دکتۆرەم و ئەندامی لیژنە محلی حزبی شیوعی عێراقم .**

***نەت پرسی لەکوێ گیراوی..؟**

**-با، گوتی لەناوچەی(کۆی سنجاق)لە ناوچەی باکور.**

***ئەویشیان کوشت..؟**

**-بەڵێ، هەر لەگەڵ ژن و منالە کوردەکاندا ئەویشیان کوشت.**

***بۆ ئەو زۆرت پێناخۆش بوو..؟**

-راست، بەڵێ زۆر پێی موتەئەسیر بووم.

***لەبەر ئەوەی عەرەب بوو..؟**

-رەنگە لەبەر ئەوە بوبێ کە قسەم لەگەڵ کرد و دکتۆرەش بوو.

***ئەی ئەو خەڵکەی دی، ئەو هەزاران ژن و منداڵ و پیرەمێرد و ژنە بە ساڵاچوانە، سەرنجیان رانەکێشای..؟**

-چۆن، ئەی من سەرەتا نەمگوت ١٥ ساڵە هەموو شەوێ وەك فلیم دێتەوە پێش چاوم..

***لە هەموو ئەو پرۆسەی کوشتن وبەکۆمەڵ لە گۆڕنانەدا جێی زۆر سەرنجی راکێشایت یاخود ئازاری داویت..؟**

-هەر لەگەڵ ئەو کۆمەڵەدا کە دکتۆرە عەرەبەکەی تێدا بوو..منداڵێك بە باوەشی ژنێکەوە بوو هەر تەمەنی ٣٥ رۆژ بۆ ٤٠ رۆژ دەبوو، بڕوا ناکەم گوللەی بەرکەوتبێ، کە دامانپۆشی ئەو دیمەنە بەردەوام لەبەر چاومە زۆر ئازارم دەدات.

***پێت وایە گوللەی بەر نەکەوتبوو.. یان دڵنیای زیندوو بوو کە داتپۆشی..؟**

-ناتوانم بڵێم سەد لەسەد گوللەی بەرنەکەوتبوو، بەڵام هێشتا زیندوو بوو کە چێلە خۆڵەکەم بەسەردا کرد.

***خەڵکی دیکەیش هەبوو کە زیندوو بێ و بەرنەکەوتبێ یاخود بریندار بێ و داتپۆشیبێ..؟**

-بێگومان هەبوو.. چونکە ژمارەیەکی زۆری خەڵك بەسەر یەکتریدا کەوتبوو، رەنگە هەبوبێ گوللەی بەرنەکەوتبێ بەڵام ئەویش لەترسا وەك مردووەکان بووە تا دامانپۆشیون.

***زۆری خایاند ئەم پرۆسەی گوللەبارن کردن و داپۆشینە..؟**

-وا هەست دەکەم سەعات دوو دەستی پێکرد، سەعات شەشی ئێوارە تەواو بووین.

***دوای ئەوە چیتان کرد..؟**

-وتم ئەوە لە ١١/٨ تا ١٥/٩ ئەو کارانە ئەنجام دەدرا، دوای ١٥/٩ ئیتر ئەو(موهیمەیە) کۆتایی هات.. هێزەکە کرایە دوو بەشەوە، بە شێکی نـێردرا بۆ پارێزگاکان و بەشێك بە پاسەوانی لای عـەلی حەسـەن مـەجید مـایەوە.

***ئەو دابەشکردنە بەخواستی خۆتان بوو..؟**

-نەخێر، ئێمە هـەمـوو وەك ئینسـانی ئـالی وابوین..هیـچ شتێ بەدەست خۆمان نەبوو.

***تۆ بەرکامیان کەوتی..؟**

-ئەوەی وا لەگەڵ عـەلی حەسـەن مـەجید دا مـایەوە.

***چ کارێکیان پێ سپاردی..؟**

-منیان برد بـۆ(تـل الـورد) کـە پـرۆژەی ئاودێریـە..دوای ئـەوە بـووم بـە شۆفێری ترێلە و کەرەڤانە و کەرەستەو مـوەلیدەی کارەبا و چیمەنتۆ و شـیش و شتی تـرم دەگواسـتەوە لـە(دۆر و ناوچـەی تکریـت)و وەك کرێکـاریش لـە مـەزرەعـەکەی عـەلی حەسـەن مـەجید لە(تل الورد) کـارمـان دەکرد.

***ئەی هەوڵت نەدا بگەڕێیتەوە بۆ شارەکەی خۆت(کوت)..؟**

-لە سەرەتای١٩٨٩ کە لە مـەزرەعـەکان لە کەرکوك و دۆر ئیشـم دەکـرد، لەگەڵ ئەفسەرێك کە مولازمی یەکەم بوو ناوی(خـەتاب)بـوو، زۆر ئیهانـەی خەڵکی دەکرد، وەك ئـاژەڵ مـامـەڵـەی لەگـەڵمان دەکـرد، مشـتومـڕێکم بـوو لەگەڵی.. ئیتر منـیان گواسـتەوە بۆ( ئەمـنی عـامـە لە بەغدا)، مـاوەیەك لەوێ بووم گوتیان بڕیـارێکی(مجلس قیـادە سـورە)هەیـە، هەرکەسـێ نفوسـەکەی بگوازێتەوە بۆ کەرکوك(تکریم)دەکرێت، ئیتر لە کوتەوە نفوسـەکەم گواستەوە کەرکوك و لەو کاتەوە لەکەرکوك دەژیم.

***کە نفوسەکەت گواستەوە چی پاداشتێکیان پێدای..؟**

-هەر کەس بهاتایە پارەیان ئەداپێی..من لەبەر ئەوەی لە(ئەمنی عامە)وە هاتبووم خانویەکیان پێدام، خانوەکە خۆی حازر بوو دروستکرابوو.

***خانوی حکومی بوو..؟**

-نەء، هی ماڵێکی تورکمان بوو لەلایەن ئەمنەوە(حجز)کرابوو درا بەمن و تاپۆیان کردە ناوم.

***ئەی نەتپرسی کە خانوی خەڵك بێت چۆن تاپۆی دەکەن لەسەر تۆ..؟**

-ئێمە حەقی ئەوەمان نەبوو، لە پارێزگا بەشێك هەبوو، بەشی(نیشتەجێ)ژمارەی خانوەکەیان ئەدایتێ و دەیانگوت ئەوە خانوی تۆیە.

***تۆ لە رووی ئینسانییەوە، جیاواز لە بڕیاری رژێم، ویژدانت چۆن رێگەی دایت لە خانوی خەڵك دابیت..؟**

-خانوو(حجز)بوو، ببووە موڵکی حکومەت..من لە حکومەتم وەرگرتوە..خاوەنەکەی حەقی لای حکومەتە نەك من.

***پێشتر گوتت کە لای خێزانەکەم کوشتنی ئەنفالەکانم گێڕاوەتەوە..ئەو لای کەس باسی ئەو کارەساتەی نەکردوە..؟**

-نەخێر..دڵنیام باسی نەکردوە، چونکە ئیعدام ئەکراین.

***ئەی خۆت هەوڵت نەداوە لای کوردێك بیگێڕیتەوە..هیچ نەبوایە تا کورد بیزانیایە کە کەس و کارە بەزۆر رفێنراوەکانی کوژراون..؟**

-بڕوا نەمابوو..ئەگەر لەگەڵ کوردێك قسەت بکردایە، دووەم رۆژ لای بەڕێوەبەری ئەمن یان ئیستخبارات دەتبینی..من دەمزانی چەنێ کورد دژی گەلی کورد بوون و زانیاریان ئەدا بە ئەمن و ئیستخبارات، بە چاوی خۆمان دەمانبینی..ئیتر چۆن بتوانم بە کوردێك بڵێم.

***ئەی لە راپەڕینەکەی ساڵی ١٩٩١ کە کەرکوك کەوتە دەستی کورد بۆ ئەوکاتە نەتدرکاند..؟**

-من له راپەڕینی ١٩٩١ لەگەڵ ژن و منالّەکانم لەترسی کورد رامانکرد بەرەو تکریت له فلکەی(عەلەم)ماینەوە تا کورد شکا، ئەو کات گەڕامەوە کەرکوك..کەرکوك چۆڵ بوو، من نەمتوانی بمێنم، چۆن لەگەڵ هێزی کورد قسه بکەم و نهێنی وا بدەم.

***دوای ئەو ساڵه ئیتر هەستت کرد وا کورد ناوچەیەکی فراوانی ئازادە و حکومڕانی تێدا دەکەن..که دەڵێی ویژدانم ئازاری دەدام بۆ هەوڵت نەدا بێته ناوچه کوردییەکان و ئەو نهێنیەش بدرکێنی..؟**

-من له ١٩٩١ تا ١٩٩٥ نقلّ کرام بۆ ئەمنی(نەجەف ) ... کێ ئەیتوانی رابکات ... برادەرێکم بوو له ساڵی ١٩٩٨ رایکرد ژن و منالّەکەیان گرد ، ژنەکەی حامیله بوو له زیندان منالّی بوو ، کاتی بەردرا منالّەکەی ساڵ و نیوێ بوو ، لەوێوە تەماشابکه چۆن بتوانم ئەو نهێنییه بدرکێنم .

***ئەی هەوڵت نەدا هیچ نەبێ له دەزگای ئەمن دوور بکەویتەوە..؟**

-نەمدەتوانی، یان دەبوو توشی موشکیلەبم گەر بمویستایه نەمێنم له ئەمن، یان دوور نەبوو حوکمم بدەن به ئەبەدی.

***ئەی دوای ساڵی ١٩٩٥..واته دوای ئەمنی نەجەف..؟**

-گەڕامەوە بۆ کەرکوك له ئەمنی(منسور)بووم.

***تا کەی..؟**

-تا ماوەیەکی کەم، بەر لەروخانی عێراق.

***ئەی کاتی روخانی عێراق، لەکوێ بووی..؟**

-له (مەتار) بەغدا بوم.

***من لەسەرەتا دەومویست ئەو پرسیاره بکەم، که تۆ پێناچێ (ئەمنێکی ئاسایی)بیت..؟**

-من پلەم(مفەوەز)ە.

***ئاخر پێناچێت مفەوەز بێت..؟**

-بۆ..؟

***لەبەر ئەوەی تۆ خوێندەواریت و تا پۆلی سێی ناوەندیت خوێندوە و ماوەی ٢٥ ساڵە خزمەتی ئەو (جیهەتە) دەکەیت..خەڵك هەبوە سەر بە ئەمن، نەخوێندەوار بووە پلەی هەبوە، یاخود بەکەمترین ساڵی خزمەت پلەکەیان بەرز کردۆتەوە..نابێ تۆ بە ٢٥ ساڵ خزمەت تازە مفەوەز بیت..؟**

-من پێت دەڵێم مفەوەزم.تۆش بەچی لێم دەگەی ئازادی.

***بە گومانم..؟**

-ئازادی..

***باشە، با بێینەوە سەر دوای پرۆسەی ئازادی..؟**

-دوای گرتنی(مەتار) گەڕامەوە کەرکوك بۆلای ژن و مناڵەکانم.

***کەی بڕیارت دا ئەم کارەساتە بگێڕیتەوە..؟**

-هەر کە کەرکوك کەوتە دەست کورد.

***لە کوێوە دەستت پێکرد..؟**

-سێ ڕۆژ لەسەر یەك چومە (محافەزە) بۆ لای بەڕێز (رزگار عەلی)، دەیانگوت محافز ناوی رزگار عەلی‌یە، بەڵام نەیانهێشت بیبینم.

***بەکەست گوت بۆ لای (پارێزگار) هاتووم..؟**

-بە دەیان کەس.بەڵام کەس گوێی لێ نەدەگرتم.

***پێت وتن بۆ کارێکی وا گرنگ هاتوم و نهێنم لایە..؟**

-بەڵێ.

***چیان پێتگوت..؟**

-هەر گوێیان لێ نەگرتم.

***بۆ..؟**

-عەرەب زۆر ئەهات سکالای هەبوو، یاخود ئەهاتن تەسلیم نەبوون.وایان دەزانی منیش هاتووم شکات بکەم، بزانە مالّم براوە، سەیارەم براوە، یان چی..

***ئەی دواتر..؟**

-وازم هێناو بێ ئومێد بووم لەوەی بگەمە بەرپرسێکی(اتحاد وطني) تا بۆیان بگێڕمەوە..

***بۆ(اتحاد وطني)..؟**

-ئاخر ئەنفال لەوان کرا.

***دواجار چۆن گەیشتی..؟**

-هەندێ مەرم هەبوو لە نزیک مالّی خۆمان دەملەوەڕاندن..کوردێک و عەرەبێك بەوێدا تێپەڕین.. بانگی کوردەکەم کرد و گوتم تۆ کوردی، وەرە من ئیشم پێتە، مەعلوماتی گەورەم لایە، بمبە بۆلای مەسئولێکی(اتحاد وطني)..کابرا لەگەلّم هات و چوینە مالّی خۆمان، هەندێکم بۆی گێڕایەوە، رۆیی و دوای دوو رۆژ هاتەوە لەگەلّ خۆی بردمی، هەندێ خەلّکم بینی کە پێویست ناکات ناویان بێنم، حەقیقەتەکانم بۆیان گێڕایەوە..ئیتر منیان ناردەوە بۆ مالّ و گوتیان خۆمان لیژنەیەکی بەدوادا چوون دەنێرین بۆلات و پێکەوە بچن بۆ شوێنی بە کۆمەلّ کوشتنەکە..ئیتر دوای ئەوە، ئەوە خۆتان هاتوون و وا ئەم چەند رۆژە خۆتان لەگەلّمدان و شتەکانم بۆ باسکردی.

*** لەبەرامبەر ئەوەی کە خۆت هاتیو ئەم زانیاریانەت هێنا، هیچ موکافەئەیەکیان نەکردی..؟**

- با..

***کێ؟**

- -دکتۆر بەرهەم

*** چەندێك موكافەئەی كردی..؟**

- خوا ئاگادارە لەبان سەرمان تەنها ئەو (٥٠) پەنجا دۆلارەیان داوە پێم، سوێندم خواردوە نایگۆڕمەوە.. سەرفی ناكەم تا مردن چونكە من بۆ پارە نەهاتووم ئەو زانیاریانەم هێناوە، من ویژدانم هانی داوم كە بەپێی خۆم بێم و ئەو راستیانەتان بۆ بگێڕمەوە.

*** لە هیچ شوێنێكی دی باست نەكردوە..؟**

-نەخێر.

***من ئامۆژگاریت دەكەم، لەبەر پاراستنی ژیانی خۆت، ئەم بابەتە با جارێ بە نهێنی بمێنێتەوە، چونكە دوور نییە لەمەودوا چەندین تیمی تەلەفزیۆنی و رۆژنامەنوسی نەك ناوخۆ رەنگە جیهانییش بێن و بەدوای تۆدا بگەڕێن..؟**

-من پێم گوتن ئامادەم لە مەحكەمە شاهیدی بدەم، ئەوەی دەیزانم و باسمكرد بیانگێڕمەوە، كە ئێوە پێتان باش بێت، جارێ باسی ناكەم..هەر تەلەفزیۆن و رۆژنامەیەكیش هاتن، گەر(ئاسایش)خۆی پێم نەڵێ قسەبكە، نایكەم.

***وا خەریكە قسەكانمان ئەوەی پێویست بوو، بەرەو كۆتایی دەچێت، گەر بپرسم پەشیمان نیت لەو كارەی كە كردوتە ..چیدەڵێی..؟**

-نەخێر، بۆ پەشیمانبم.

***هیچ نەبێ لەبەر ئەوەی تاوانێكی گەورە بە بەرچاوتەوە روویداوە..؟**

-نا پەشیمان نیم.. راستە تاوانێكی گەورە بوو، بەلام خۆمن نەمكردوە، ئەوە نییە من ویژدانی خۆم ئاسودە دەكەم، هاتووم دەیگێڕمەوە..گەر من نەبم كێ ئەو حەقیقەتەتان پێدەڵێ..

***جاری واهەیە ئینسان تاوانێكی وا گەورە دەبینێ لەبەر ئەوەی دەسەلاتی نییە رێگەی لێبگرێت، خۆزگە دەخوازێت هەر لە دایك نەبوایە، بۆ ئەوەی ئەو**

**تاوانەی نەدیتبایە..مەبەستم ئەوەیە..؟ دەڵێم تۆ هیـچ نـەبێت حـەزت نـاکرد خوێندەوار نە بویتایە، وەك خوشـك و براكـانت لـە لادێ بژیایتایـە، یـاخود تێکەڵ ئەو کارە نەبوایەی بۆ ئەوەی ئەو تاوانە نەبینی..؟**

-نەخێر پەشیمان نیم.بەڵام حەزم دەکرد دەسەڵاتم هەبوایە هـەر ئـەو کاتـە تۆڵەی ئەنفالەکانم بکردایەتەوە.

*** من و تۆ قسەی، ترمان دەمێنی، بەڵام ئەو کاتەی کە چووینـە دادگـا.. چونکە ئێمە هەوڵ ئەدەین لـە دادگـای نێودەوڵـەتی مەلـەفێك بـۆ ئـەنفال بکەینەوە ، تۆ شایەتحالێکی ئـەو مەلەفـەی ... ئـەو کـات وردەکاریـەکانی دادگا و شایەتی دانەکەت و ئەم دیدارە پێکەوە ئەکەین بە کتێبێك.**

- بەسەر چاو.



# بەرهەمە چاپکراوەکانی نووسەر

| | |
|---|---|
| تەمو دوکەڵ | ١٩٩١ |
| کەرنەڤاڵی مەرگ | ١٩٩٢ |
| مارشی نەبەزین | ١٩٩٣ چاپی یەکەم |
| | ١٩٩٧ چاپی دووەم |
| سەید جەوهەر جەوهەر بو بۆ کوردستان | ١٩٩٩ |
| کۆچ و کۆچپێکردن هۆکارو بنەماکانی | ٢٠٠٠ چاپی یەکەم |
| | ٢٠٠١ چاپی دووەم |
| شایە تحاڵەکانی ئەنفال ( بەرگی یەکەم ) | ١٨/شوباتی ٢٠٠٢ |
| شایە تحاڵەکانی ئەنفال ( بەرگی دووەم ) | ٦/ئەیلولی ٢٠٠٢ |
| شایە تحاڵەکانی ئەنفال ( بەرگی سێیەم ) | ١٨/شوباتی ٢٠٠٣ |
| گەڕانەوە بۆ کەرکوك | ئازاری ٢٠٠٤ |
| لەتۆپخانەوە بۆ عەرعەر | ئازاری ٢٠٠٤ |
| کەرکوك و پاکتاوی رەگەزی | ئازاری ٢٠٠٤ |
| لەنوم رێعانەوە بۆ تۆپزاوا | ئازاری ٢٠٠٤ |

